( دانا زانایە ، زانا توانایە )




# خۆشخوانی



## گوزارەکاری . ڕەوانکاری . جوانکاری

« ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی ڕەوانبێژی لە زمانی کوردیدا . »

« ئەو هونەرانە کە لەم زمانەدا دیمەنەکانیان بە ڕوخسارن . »

« گوزارەکاری و ڕەوانکاری و جوانکاری لە گوزارەو وشەی کوردیدا بە نموودن . »

علاءالدین سجادی

بە بڕیار و لە سەر ئەرکی « زانکۆ »ی سولەیمانی لە چاپدراوە .
مافی لە چاپدانەوەو بلاو کردنەوەی تەنها بۆ « زانکۆ »ی سولەیمانیە .

چاپخانەی مەعارف - بەغدا
١٣٩٨ ھ - ١٩٧٨ م

# خۆشخوانی



## گوزارەکاري . رەوانکاري . جوانکاري

« روونکردنەوە و چەسپاندنی رەوانبێژی لە زمانی کوردیدا . »

« ئەو هونەرانە کە لەم زەمانەدا دیمەنەکانیان بە روخسارن . »

« رەورەوەی مێژوو هونەری قسەیی لە زمانی کوردیدا دێنێتە ناوەوە . »

« گوزارەکاري و رەوانکاري و جوانکاري لە گوزارەو وشەی کوردیدا بە نموودن .

علاء الدین سجادی

بە بڕیار و لە سەر ئەرکی « زانکۆ »ی سولەیمانی لە چاپدراوە .



چاپخانەی مەعارف ـ بەغدا

١٣٩٨ هـ ـ ١٩٧٨ م

# گوزارشتێک

زمانی کوردی ئەبێ رەوانبێژی تێدا هەبێ ، ئەم کتێبەش قسە لە رەوانبێژی‌یەوە ئەکا .

بابەت جیایە و «ناو» جیایە ، بابەتەکە برێتـــی‌یە لەو هونـــەرە بەلاغی‌یانە کە لە زمانەکەدا هەن ، ناوەکە برێتی‌یە لـــە « ناو » بۆ بابەتی ئەو هونەرانە . وێنەی ئەمە وەکوو ئەوە کە « دانا ، نەوزاد ، تارا » ناوی ناون ، ناو بۆ دانراوەکە ، واتە « مسمی »کان ، ئەوان شتێکی‌ترن کـە جیان لە ناوەکان .

لێرەشا بابەتی هونەرەکان شتێکن و ناوەکان شتێکی‌ترن کە جیان لە یەک .

لە نێوانی رەوانبێژی و خوشخوانی ، وە یا بەلاغە و رەوانبێژی ، وە یا بەلاغە و خوشخوانی گەلێ شت هەیە ؟ رستەی رەوانبێژی ؟ واتە وتنێک کە بێ گرێ و قۆرت بوترێ ، هەمووی ئەگرێتەوە .

وشەی « رەوان » رویشتنێکە کە هیچ کۆســـــبی نەیەتە بەرە « بێژی » بە مانا وتن . تێکراکەی وای لێ‌ی دێتەوە :

وتنێک ، قسەیەک کە بە بێ قۆرت و بە رەوانی بوترێ . ئەو رستەیەش کە ئەوترێ :

« دەرسەکەی رەوانە » ئەو رەوانەش هەر لەم رەوانەوە هاتووە .

« خوشخوانی » واتە : جوان و شیرین خوێندن . کە وتت خوێندن

هەموو جۆرە خوێندنێک ئەگرێتەوە ؛ خوێندنی بەرز و نزم ، ڕەوان و نارەوان ، هی ئەو زمانەو غەیری ئەو زمانە ، بەڵام زاراوە تایبەتیەکی دایە و کردی بە نـاو بـۆ شتە نووسراوەکە ؛ واتە نووسراوێکی خوش خوێن • ئەمجا تایبەتیەکی بۆ دروستکرا ، کرا بە ناو بۆ ئەو بابەتـە بەلاغی‌یانە کە زمان کۆک ئەکەن بۆ ڕاهاتن بە ڕستەو قسەی جوانەوە ، وە یا بۆ ئاشکراکردنی وتنی بەنرخ و بەجێ •

ئەمجا من هاتم دەستکاریەکی ترم تیـا کرد ؛ واتە زاراوەیەکی ترم دروستکرد • ئەمەش کە ئەیڵێم وەنەبێ زۆر ڕۆیشتبم !ە هەموو زاراوەیەک سەرەتا یەکێک دایئەنێ و پاشان بڵاو ئەبێتەوە •

هێنام ڕستەی « خوشخوانی »م کرد بە وشەیەک و کردم بـە ناو بۆ ئەو کتێبە کە قسە لە ڕەوانبێژی‌یەوە ئەکا • وەکوو لە کاتی خۆیا ڕستەی « نرخ‌شناسی »م کرد بە ناو بۆ ئەو کتێبە کە باس لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی‌یەوە ئەکا • ئەم جۆرە ئیشکردنەش لە هەموو زمانێکا هەیە و هیچ جێگای سەر سرمان و ڕەخنە لێ‌ی گرتن نی‌یە •

علاء الدين سجادي

١٩٧٨/٥/٣

# ئەدەب بەچی یە و ڕەوانبێژی چی یە ؟

## ٤ ئاشنایەتیەکیان پێکەوە هەیە ؟٥

ئەدەب بە چەمکی گشتیی گوزارەیەکی زۆری هەیە ، بەلام بە جۆرێکی تایبەتی و بۆ قسە لێوەکردن لەم شوێنەدابرێتیی یە لەو :

شتە نایابانە کە پێشینان هێشتوویانەتەوەو بەجێیان هێشتوە بۆ دوای خۆیان ؛ ئەوانەش وەکوو هۆنراو و پەخشان ، پیشەی قەشەنگ ، مووزیقاو سازو ئاواز و وێنەی بە پەرداخ • ئەمانە بە قسەی جوانی مرواری ئامێز – نووسراوە بوو بن یا نە نووسراوە – بەڵگەی کۆنی سەر پەردەکان کە داستانی ئادەمیزاد ئەگێڕنەوە ، ئەو نەوا کاریگەرانە کە لە تەلی مووزیقاکانەوە دەر ئەچن و مێشک و دڵو دەروون گولاو پاشی ئەکەن •

جا ئەم ئەدەبە بەم جۆرە وەنەبێ تایبەتی بێ بە نەتەوەیەک و نەتەوەیەکیتری لێی بێ بەش کرا بێ ، چونکە ئەمانە لە کردو کۆشی زانکۆی ئادەمیەن ، بەڵکوو وەکوو تیشکی خەتەکانی ڕۆژ چۆن هەموو لایەک ئەگرنەوە ئەویش وایە ، ئەگەر نەتەوەیەک بۆی نەلوا بێ بەشەکەی خۆی شاردۆ بکا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نەیبووە ، بەڵکوو ئەوە ئەگەیەنێ کە بەرهەڵستێک لە ئارادا بووە بۆ ئەو شاردۆ نەکردنە، کە بەرهەڵستەکە نەما مەیدان فراوانە بۆ کۆ کردنەوەی ، وەکوو ڕووناکی ڕۆژەکە کە لە ناو ژوورێکی بە چوار دیوار گیراوا دەر ناکەوێ ، هۆیەکە دیوارەکانن – کە بەرهەڵستەکەیە – کاتێ ئەو بەرهەڵستە لاچوو ڕووناکیەکە جێگای خۆی ئەگرێتەوە •

ئەمە ئەدەب ، ئەمجا « رەوانبێژی » « تان» ی ئەو ئەدەبەیە •

لە زمانی عەرەبی‌دا بەو قسەو باسەی رەوان و گەوارایێ ئەڵێن

« بلیغ » و پاشان « بلاغه »ی لێی وەرگیراوە بۆ هەمووی و بووە بە ناو بۆ زانیاری‌یەکە •

لە زمانی کوردی‌دا ئەو چەمکە کە « بلاغە »ی لە زمانی عەرەبی‌دا بۆ دانراوە وشەی « رەوانبێژی » بە تەواوی پڕی ئەکاتەوەو بەلکوو زیاتریش • وە بۆ « بلیغ »ەکەش من بەلامەوە « پاراو » جێگای خۆیەتی •

جا لەبەر ئەوە وشەی « رەوانبێژی » بۆ ئەو زانیاریە دانراوە ، وە تەنانەت ئەتوانرێ بوترێ وشەی «خۆشخوانی»ش هەر چەشنی مەبەست ئەدا بە دەستەوە •

رەوانبێژی ، وە یا خۆشخوانی روو لە سووچێک لە سووچەکانی ئەدەب ئەکاتەوە ؛ واتە روو لە قسە بە هەر دوو چەشنەکەیەوە - هۆنراو و پەخشان - ئەکاتەوە ، ئەو هۆنراو و پەخشانە ئەبێ بە پێی پلە تێگەیشتنیان تێدا هەبێ ، تێگەیشتنەکەش بە هۆی هونەرە قسەیە ئاشکراکانەوە ئەبێ ، ئەمانەش لە ناو چوار چێوەی رەوانبێژی‌دان کەوا بوو ئاشنایەتی ئەدەبو رەوانبێژی وەکوو ئاشنایەتی مرۆڤ و گیانلەبەرە ؛ مەرجە هەموو مرۆڤێک بەر گیانلەبەر بکەوێ ، بەلام مەرج نی‌یە هەموو گیانلەبەرێک مرۆڤ بێ •

وترا کورد ئەدەبی هەیە ، کە هەیبوو ئەبێ رەوانبێژیشی هەبێت ، ئەمیش هەر وەکوو ئەدەبەکە وەنەبێ تایبەتی بێ بە زمانێکەوە ، بەلکوو هەموو زمانێک بۆی هەیە لە سەر رێچکەی زمانەکەی خۆی بەشی خۆی لێی وەر بگرێ • لەبەر ئەوەتیمەش ئەتوانین بڵێین : رەوانبێژی لە زمانی ئێمەش‌دا هەیە • جا بەو بۆنەوە ئەڵێین :

رەوانبێژی لە سەر ئەو چەمکە کە زمانی کوردی وەری ئەگرێ لەگەڵ باسی زانیاریی زمانەکانی تردا - کە هەر یەکە بۆ خۆیان کردووە-

بڕیتی‌یه له ده‌ربڕینی کۆمه‌ڵه گوزاره‌یه‌کی فراوان له قاڵبی چه‌نـد وشه‌یه‌کی که‌مدا .

راسته وشه له دایه‌خی ئه‌وه ده‌رنایه که به فراوانی باوه‌شی خۆی بۆ گوزاره والآ بکاته‌وه ، به‌ڵام ئه‌و جارانه که تا ئه‌ندازه‌یه‌ک له دایه‌خی ده‌ردێت ئه‌توانرێ به راوانبێژی ناو ببرێ .

ئه‌م له دایه‌خ ده‌ر نه‌هاتنه هه‌ندێ جار روو له تام و چێژی خاوه‌ن قسه‌و گوێگر ئه‌کاته‌وه ، که ئه‌و خاوه‌ن قسه ، وه یا بڵێین قسه‌که‌ره به جۆرێکی تایبه‌تی گوزاره په‌نگ خواردووه‌کانی ده‌روونی ئه‌ررژێنێته ناو قاڵبی وشـه‌وه ، گوێگریش به سۆزێکه‌وه وه‌کوو هه‌نگ چـۆن شیره‌ی گوڵ ئه‌مژێ ، ئه‌ویش په‌رده‌ی دڵ و ده‌روونی هـه‌ڵئه‌داتـه‌وه بـۆ وه‌رگرتنی ئه‌و وشه‌و گوزارانه وه‌ریان ئه‌گرێ و هه‌ڵیان ئه‌مژێ .

هه‌ندێ جاریش یا روو ئه‌کاته ناوه‌رۆکی شته‌که‌و به تـه‌واوی ئاراسته‌ی ئه‌و ناوه‌رۆکه ئه‌بێ بۆ هه‌ڵسه‌نگاندنی ، یا راسته‌و راست روو ئه‌کاته وشه‌و گوزاره بۆ رازاندنه‌وه‌یان .

یه‌که‌میان له زانیاری ره‌وانبێژی‌دا مـن به‌ناوی « گوزاره‌کاری ـ مه‌عانی » ، دووه‌میان « ره‌وانکاری ـ به‌یان » ، سێ‌یه‌میان « جوانکاری ـ به‌دیع »ه‌وه ناویان ئه‌به‌م .

دیاره ئه‌م سێ لقه‌ش خۆیان له ناو وشه‌کانی خۆیانا ئه‌توێنه‌وه ؟ واته هه‌ر یه‌که‌یان ئه‌بن به چه‌ند هونه‌ر و په‌شه‌وه .

# ئاشنایەتی ڕەوانبێژی و لێکۆڵینەوە

مەبەست بە لێکۆڵینەوە لەم شوێنەدا ئەوەیە کە لە پارچەیەکی ئەدەبی ورد بینەوە بۆ ئەوە بزانین دروست و تەواوە ، یا خەوشێکی تێدا هەیە و ڕاستیەکەی ون بووە • بۆیەش مەبەست ئەمەیە چۆنکە لێکۆڵینەوە بۆ شتی‌تری غەیری ئەدەبی‌ش بەکار هاتووە ؛ واتە بۆ شتی کردەوەیی ، وە یا بێژراوی • لێرەدا مەبەست بێژراویەکەیە و مەبەست ئەوەیە لەو جەوهەرە مەعنەوی‌یەوە قسە بکرێ بۆ ئەوە پەردەی تاریک لە ڕوویا هەڵبدرێتەوە •

ئەدەب خۆی لە مەعنەویاتە ، کە ئەڵێن لە مەعنەویاتە ؛ واتە ئەو چەمکانەی کە لەودا هەن وەنەبێ شتێک بن کە بە چاو ببینرێن ، وە یا بە دەست بگیرێن ، لێکۆڵینەوەکە ئەو جەوهەرە حەقیقیە دەر ئەخا •

بەلاغە بۆچی‌یە ؟ • دیارە بۆ ئەوەیە کە ئەدەبەکە ڕوون بکاتەوە ، واتە زانیاری‌یە جەوهەری ئەدەبەکە پیشان ئەدا • دوور نی‌یە بوترێ هەر شتێک لە زانیاری بەلاغەدا باسکرێ لە زانیاری « نەحو »یشدا هەیە • بەڵێ ئەمە ڕاستە بەڵام زانیاری نەحو شتێکی‌ترە و زانیاری بەلاغە شتێکی‌تر • شتی وا ئەبێ بەلای بەلاغەوە ڕاستە ، کەچی زانیاری نەحو دانی پیا نانێ ، هەروەها پێچەوانەکەشی •

جا ئەم بەلاغەیە ئەدەبەکە بەش بەش ئەکاتەوە ؛ هەندێکی بە جوانکاری ، هەندێکی بە ڕەوانکاری ، هەندێکی بە گوزارەکاری • چۆن دەغڵێک سەرەتا «کەو» پاشان « سەرەن » پاشان « بێژنگ » ئەکرێ تا پوختەکەی بە تەواوی دێتە دەست ، بەلاغەو ئەدەبیش وایە ؛ ئەدەبەکە

هەیە ، بەلاغەکە ئەو ئەدەبە پوختە ئەکا و دیمەنێکی جوانتر لە قسەکانا پەیدا ئەبێ .

لێرەدا مەرج نیی‌یە هەر شتێک ـ بەتایبەتی قسە و نووسین ـ نلو پرا بە ئـەدەب « بلێغ وپاراو » بێت ، بەڵام مەرجە لەم رووەوە هەمو شتێک بەلێغ بوو ئەبێ بە ئەدەب و ئەدەبە . زانیاری بەلاغەکە « تان » و « پۆ »یەکی ئاوریشمە بۆ پارچەی خۆماڵی ئەدەبەکە .

ئەمجا بەلاغە و لێکۆڵینەوە .

ئەبێ ئاشنایەتیەکی تەواو هەبێ لە نێوانی ئەم بەلاغە و لێکۆڵینەوەدا، چونکە بەلاغەکە بۆ ئەدەبەکەیە ، لێکۆڵینەوەش هەر بۆ ئەدەبەکەیە . ئـەتوانین بڵێین لێکۆڵینەوەکە بە دوو چاو سەیری ئەدەبەکەو سەیری بەلاغەکە ئەکا . لێکۆڵینەوەکە لە سەر بناغەی ئەو زانیاریە کە هەیەتی وەکوو چۆن سەیری گرانی و سووکی ، بەرزی و نزمی ئەدەبەکە ئەکا، بەو جۆرش ئەچێتە پارێزەوە بۆ سەیر کردنی بەلاغـەکە . بەڵکوو بەلاغە ، کە بریتی بوو لەو سێ بابەتەی پێشوو ، وە هاتە سەر ئەوە کە ئەدەبەکە لە ناو ئەوانەدایە ، بوو بە وەکوو هەڵم لە ناو ئاودا و بـبوو بەوان . لێکۆڵینەوەکە ئیتر لەوانەیە بە تەواوی گۆرری خۆی بەستێتەوە بۆ پەلاماردان لەو بابەتانە ..

ورد ورد تەماشـای ئەوە ئەکا کە ئایا ئەو ئەدەبەی کە بەلاغە بـە جوانـکاري ، وە یا رەوانـکاري ، وە یا گوزارەکاري دانـاوە راسـتە وانە یان نەء ؟ . راستە هونەرە قسەیە ئاشکراکان لەو بەشەدا هەن ؟ . راستە ئەو زانیاری‌یە کە چۆنیەتی وشەی پێ ئەزانرێ ، ئەو زانیاری‌یەی تێدا هەیە ؟ . راستە گوزارەی بەرز و ناسک لەو رستەیەدا هەیە ؟ . راستە جوانیی وشە لەو شوێنەدا هەیە ؟ . راستە کە یەک گوزارە بە

هۆی وشەی جۆراو جۆرەوە باسبکرێ ؟ ، وە یا یەک وشە چەنـــد گوزارەی لێ وەر بگیرێ ؟ ، راستە لە بـــاری گوزارەکاری یەوە ئەزانرێ کام وشە وە یا رستە جوان و دلگیرە وە یا جوان نی یە ؟ .

لێکۆڵینەوە سەیری ئەوە ئەکا کە هەر یەک لەمانە شـــوێنی خۆیانیان گرتووە؟ یان نە ؟، بە دوو چاوی تیژو ورد بین تەماشا ئەکا، ئەوەی کە قوتابخانەی بەلاغە بەخوازە ، یا خواستن ، یا درکە ، یــا وەک یەک ، وە یا کورتبرری ، یا لێکدان ، وە یا هونەرەکانی تری داناوە ئایا وانە یان نە ؟ . وەکوو وەستایەکی گلکاری لێ دێ کە وا خشت و نەخشی زێررین لە خەلفەکە وەر بگرێ و دابرر‌ێـــــــژێ ، چونکـە لێکۆڵینەوە سەیری دەق ئەکا ، سەیری چەشنی نووسینی ئەو دەقـە ئەکا .

سەیری ئەوە ئەکا کە ئەم دەقە هی کێ ، وە هی چ سەردەمێکە، سەیری ئەوە ئەکا کە دەقی رەسەنی لە هی لاوەکی جیا ئـەکاتەوە ، وشەی زبرو نەرم لە یەك ئەکاتەوە ، ئەزانێ چ وشەیەک بۆ چ شوێنێک دەست ئەدا ، چ رستەیەک بۆ چ جێگایەک بە کەڵکە ، کام وشە و رستە کاریگەریەکەیان زیاترە بۆ جێگای خۆیان ، ئەم لێکۆڵینەوەیــە بۆمان روون ئەکاتەوە کە خاوەنی دەق توانیویە سەرکەوێ لە بەرهەمەکەیا ، یان نە ؟

گومانی تێدا نی یە ئەو دەقە کە لێکۆڵینەوە ئەم بزارەی تێدا ئـەکا رستە و هۆنراو و وشەیە ، خاوەنی بەلاغە ئەو رستەو هۆنراو و وشەیە کە هێناویە و ناوی گوزارگاری و رەوانکاری و جوانکاری بۆ داناوە ، ئەم ئەتوانێ ــ واتە لێکۆڵینەوە ــ لە پاش وردبوونەوە رەخنە لە خاوەن بەلاغە بگرێ بلێ : ئەوەی کە تۆ لە زانیاری یەکەی خۆتا بەکارت هێناوە،

لەبەر ئەم هۆیەو ئەو هۆیە ئەو وشە ، وە یا ئەو رستەیە بە کەڵکی ئـەو شوێنە نایە .

کەوا بوو ئاشنایەتی لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەلاغەدا وەکوو ئاشنایەتی بەردی مەحەکە لەگەڵ زێڕردا ؟ چۆن ئـەو بەردە زێڕرێکی پوختەت بۆ ئەدۆزێتەوە و ئەیدا بە دەستەوە . ئەمیش کرۆکێکی پوختەی ئەدەبی ئەدۆزێتەوە و ئەیخاتە بەر چاوی ئەهلی بەلاغە .

لەمەوە ئەوە دەرکەوت کە چەندە ئاشنایەتی ئەدەب و رەوانبێژی پێکەوە هەیە ، ئاشنایەتی لێکۆڵینەوە و رەوانبێژی گەلـێ بە تینتر و بەهێزترە لەو ، چونکە بەلاغەکە هەر روو لە ئەدەبەکە ئەکاتەوە ، بەڵام لێکۆڵینەوەکە روو لە بەلاغەکە و لە ئەدەبەکەش ئەکاتەوە و لە پارێزایە بۆ هەر دوو لایان .

# گرێ لێ دان

لە زمانی کوردی دا رستە ، وە یا « واژە »ی « زمان پاراو » هەیە، ئەمە بەلای منەوە ئەو چەمکەیە کە لە زمانی عەرەبی دا بە وشەی «فصیح» و « فصاحة » گوزارشتی لێی دراوەتەوە • ئەڵێ : « زمانێکی پاراوی هەیە » ، واتە فەسیحە و هیچ گرێ و گوڵی نایەتە بەر زمان • دیارە یەکێ کە زمانی پاراو بوو بە رەوانی قسەکانی لە دەم دێتە دەرەوە و هەڵەی تێدا نابێ ، وە یا کەم ئەبێ • ئەوەی کە هەڵەی تێدا نابێ رەوانبێژی و بەلاغەکە ئەگرێتەوە • ئەم رەوانبێژیەش لە هەموو سەردەمێکا ئەوەیە کە ئەو قسانە شان بە شانی چۆنیەتی بابەتەکە بڕروا بەرێوە • واتە لەگەڵ «مقتضی‌ی‌حال» دا بەرانبەری بکا • لەم بەرانبەری کردنە بەشەکانی رەوانبێژی دروست بوون •

باسی « گرێ لێدان » کە دێتە پێشەوە ئەوەیە کە رەوانبێژی‌یەکە ئەو گرێ و گۆڵیەی کە بە « گرێ‌لێ‌دان » گوزارشتی لێ‌دراوەتەوە تێدا نەبێ ، بەڵام ئەبێ بزانرێ کە ئەم گرێ و گۆڵیانە چی‌ـن ؟• بۆ ئەوە تۆ کاکڵەکەت بۆ دەرکەوێ •

ئەگەر هەموو شت چاک بوو خـراپت بـۆ دەر ناکـەوێ • پێچەوانەکەشی : ئەگەر هەموو شت خراپ بێ ، چاکت بۆ دەر ناکەوێ• کەوا بـو ئەبێ بڵێین ئەو شتەو ئـەو شتە خراپە بۆ ئەوە چاکەکەت بـۆ روون بێتەوە ، و • یا ئەو شتە و ئەو شتە چاکە بۆ ئەوە خراپەکەت بۆ دەرکەوێ •

راستە گرێ لێدان بەلای زانایانی ڕەوانبێژیەوە لە هونەرەکانی ڕەوانبێژی نی‌یە ، بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەم گرێ لێدانە کامەیە و چی‌یە ؟ ، هەتا تۆ بتوانی راستیەک بخەیتە روو ، جا لەبەر ئەوە بەلای منەوە باسکردنی گرێ لێدان لە باسی بابەتەکانی ڕەوانبێژی‌دا باسبکرێ ٠ کە ئەڵێن باسبکرێ مەبەست ئەوە نی‌یە کە خودی گرێ لێدان لە کرۆکی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی‌یە ، بەڵکوو مەبەست بابەتەکەیە ٠ پێچەوانەی ئەم گرێ‌لێدانە ئەبێ بە یەکێ لە بابەتەکانی ڕەوانبێژی ، وە بە تایبەتی‌تر پێچەوانەی ئەم گرێ‌لێدانە ــ کە گرێ کوێرەی تێ‌ی ئەکەوێ ــ « ئاشکرا ــ وضوح »، « وضوح خۆی بە هۆی « تەغلیب »ەوە بوو بە یەکێ لە بابەتەکانی ڕەوانبێژی ؛ ئەو بابەتانە کە ئەبێ ڕەوانبێژی لەمانەی تێدا نەبێ ،

ئەمە و دیسان ئەگەر راست ئەوێ ، ئەوی ئەم خێوەتی ڕەوانبێژی و بەلاغەیە دایگرتۆتەوە هەمووی لە « نحو » و «منطق » دا هەیە ، هەر ئەو قسانەی نەحۆ و مەنتقە ئەم ئەیانکا بە ڕەوانبێژی ، ئایا ئەمە ئەشێ کە بووترێ : قسەکانی ڕەوانبێژی هەموو لە زانیاری‌یەکانی نەحو و مەنتق‌دا هەن ، کە وا بوو ئیتر پێویست بەوە ناکا زانیاری‌یەکی سەربە خۆی بۆ دابنرێ و بە ڕەوانبێژی ناو ببرێ ؟! ، دیارە ئەمە ناشێ ، چونکە هەر زانیاری‌یەک کەسیەتی خۆی هەیە و ئەبێ لە ناو چوار چێوەی ئەو کەسیەتیەدا باسی ورد و دروشتی بکرێ ،

بابەتێکی وەکوو گرێ لێدان ئەگەر لە ناو چەنبەری ڕەوانبێژی‌دا باس نەکرێ ، ئەی ئەبێ لە کوێ‌دا باسبکرێ ؟!، هەر ئەبێ لە ڕەوانبێژی‌دا باسبکرێ ، کە ئەمە هەبوو ئەویش خۆی بوو بە بابەتێک لە بابەتەکانی ڕەوانبێژی ، بەڵام بۆ دوور کەوتنەوە لێی ، نەوەک بۆ نزیک بوونەوە ٠

ئیتر لەبەر ئەمە من هاتم لە پێش هەموو بابەتە سەرکیەکانا «گرێ لێدان»م دانا ، بۆ ئەوە ئەمە ببێ بە دەروازەیەک بۆ چوونە نلو هەموو بابەتەکانی رەوانبێژی‌یەوە . وە لە باوەرری منا ئەبێ بابەخ بدرێ بە گرێ‌لێ‌دان . جا زانایانی بەلاغەی عەرەبی گوێ ئەدەنێ ، یا نایدەنێ ، من گوێ بەو گوێ‌دان و نەدانە نادەم ! .

دیسان دوور نی‌یە بووترێ شتێـک کە بە کـــێشە بوو بۆ تێگەیشتنەکەی بۆچ ئەبێ ئەمە بەر هونەر بکەوێ ؟ .

لە وەڵامدا ئەوترێ بە جۆرێکی تێکرایی کەڵک لە هـــونەری ــ بەتایبــەتی گوزارەکاری دا ــ ئەوەیە کە نەوس لە باری وشـە و گوزارەوە لەزەت و خۆشیەک وەر بگرێ ، وەرگرتنەکەش ئەوەیە کە گەلێ شت لە دڵی خاوەن «دەق»دا پەنگ ئەخواتەوە ، دێنێ بە جۆرە وشەیەک دەریـان ئەبرێ کە خوێنەر ، وە یا گوێگر لەپاش خـەریک بوونێک لە گەڵیا ، لە پاش زانینی ، پشوویەکی خۆشی پیا دێتەوە . دیارە ئەمە بێ گومان بۆ نەوسی ئادەمیزاد بەهرەیەکە ، کە بە هۆی ئەو وشانەوە وەری ئەگرێ و حەسانەوەیەکە بۆی .

کەوا بوو توانرا بوترێ «گرێ لێدان» هەر چەندە لە رواڵەتـا گرێ کوێرەیە بەڵام لە ناوەرۆکا حەسانەوەی نەفســە و نەفس پێ‌ی گەشەدار ئەبێ .



جا ئەم گرێ لێدانە وا ئەبێ لە وشەدا ئەبێ ، وە واش ئەبێ لە گوزارەدا ئەبێ . کە وا بوو بوو بە دوو بەشەوە .

وشەیکەش ئەگونجێ بە هۆی پێچ و پەنایەک بێ کە لە وشەکانـا هەیە ، واتە لە ریزکردنی ئەو وشانە کە لە رســـتەکەدا هەن پێـچ و

پەنایەک هەیە بۆ وەرگرتنی گوزارەکە ، وە یا راناو و هێمـــایەکی زۆریان تێی ئەکەوێ، وە یا دانانی جۆرە وشەی وا لە چەشنە رستەیەکی وادا ئەبێت کە سڵەماندنەوەیەک ئەدا بە گوێ و تەزوێک بە نەفسەکەدا دێت .

کەوا بوو وشەیەکەش بوو بە چوار بەشەوە .

بەشی دووەم لەو گرێ لێدراوە ئەوە بوو وترا گوزارەییە .

لەم گوزارەیەدا وا دیارە خوازە و درکە و خواستن بە تەواوی دەستیان تێدا هەیە ، یا رستەش پەخشان بێت ؟ چونکە خاوەن رستە بە بەکار هێنانی هەندێ وشە لە رستەکەیا ئیشێکی وا ئەکا کە بە تەواوی خۆی لە گوزارە راستەقینەکە دوور ئەخاتەوە .

لەم بەشەیانا دوور نی‌یە نیازەکە لە دڵی خاوەن دەقا بە تەواوی چەسپ نەبوو بێت بۆیە ئەم گرێ لێدراویە پەیدا ئەبێ .

جا ئێمە لێرەدا بۆ بەشەکانی گرێ لێدراوی وشەیی هەر یەک ، وێنە دێنینەوە . ئەوەش بەر ئەوەیان ئەکەوێ کە راناو و هێمایەکی زۆر لە رستەکەدا بەکار هێنرابێ و گرێ لێ دراویەکەی دروست کردبێ، بۆ سێ بەشەکەی‌تر خوێنەر ئەتوانێ خۆی لێکی بداتەوە .

هۆنەر ئەڵێ ـ رەنگبێ خاوەنەکەشی ، سجادی ، بێ ـ

**عەتارد ، موشتەری ، مەرریخی دەورانە**

**نیگاری من لە ناویانا نیشانە سونعی سوبحانە**

**ئەگەر ئەم بێ ، وە یا ئەو بێ ، وە یا جوزئێکی ئەم ئەو بێ**

**وە یا هیچ یەک نەبێ هەر خارجێ ئەوسافی ئینسانە !**

تەماشا ئەکەین یەکەم نیوە هۆنراوی دووەم ئەوەندە « ئـــەم » و « ئەو »ی تێی کەوتووە ـ کە ئەمانە راناو و هێمان ـ بە تـــەواوی

لەوانەیە سەریان لە خوێنەر تێکدا بێ و گرێ لێ دراوی‌یـــان لـــە هۆنراوەکانا دروستکرد ووە ٠

وە بۆ گوزارەییەکەش « بێخود » ئەڵێ :

**غەزالی ئاگرین وەختێ کە بورجی ئاسمانی گرت**

**نیهالی قامەتی رۆمی لەگەڵ زەنگی بەرابەر کرد**

مەبەستی هۆنەر بە غەزالی ئاگرین کوورەی «رۆژ ـ خور » « بە بورجی ئاسمان بورجی « حەمەل »، بە رۆمي « رۆژ » و بە زەنگي « شەو »، ٠

مانای تێکرای ئەوەیە ئەڵێ :

کاتێ رۆژ گەیشتە بورجی حەمەل « شەو و رۆژ بەرانبەر وەستان و بوون بە ئەندازەی یەک ٠ دیارە ئەمەش رێکەوتی شەوی «٢١» مارت کە شەوی نەورۆزە ٠



بەرانبەر بەگرێ لێدراو « ئاشکرا « هەیە « ئاشکراش ئەوەیە کە هیچ یەک لە بەشەکانی گرێ لێدراوی تێدا نەبێ ، نە وشەیی ، نـە « گوزارەیی « وێنەش بۆ ئەمەیان وەکوو « پیرەمێرد « لە باسی سەرچاوەی « زەڵم »دا بە هۆنراو ئەڵێ :

**ئاوە جوانەکەی سەرچاوەی زەڵــم**

**بۆ گەلا رێژان سەر بە تەم و هەڵم**

**ئەڵێی سەرچاوەی بەختی کوردانــی**

**ســرموتت نی‌یە ، وێلی هەردانی**

**تافگەکەت سەر بەرز ساردە وەک تـــەرزە**

**دانەی مرواری لەنجەی ســـەد تـــەرزە**

**لە و ئاسمانەوە ئەررژێیتە خوارێ**

له چاوی گەردوون فرمێسک ئەبارێ

وێنەی عاشقێ کە ناڵـــە کـار بـێ

سەحرا نەومرد بـێ ، پەیجۆری یار بـێ

وێڵ و سەرە رۆ، بە رۆ، رۆی پڕ دەرد

لە قەڵبەزەوە سـەر ئەدەی لە بەرد

دەست لە ملانی لـەگەڵ « تانجـەرۆ »

بە سەودای « سیروان » شەیدا و رەنجەرۆ

لە « دواوان » دا کە یەک ئەگەوی

دوو « مصرعی » بۆ بەیتی مەولەوی :

«سیروان»ی ئەم چەم، «تانجەرۆ»ی ئەو چەم

بدەن بە یەک دا ئەم چەم تا ئەو چـەم

مەوەستە برۆ بـە لـم و خاکـا

بگری لـە بارگەی سەلمانی پاکـا

پێی بڵێ قـوربان تۆ نـاوت پاکـە

بمانخـەرە رێ یەکیـەتی و چـاکە

لەبەر ئاودێـری ئـەو خاکە دێمـە

کە پاراو ئەبێ بـە ئاوی ئێمـە

با گوڵ و نێـرگس هەر دوو پێـکەوە

شـاد بن بـە دڵی رێک و پێـکەوە

وەکوو سەیر ئەکەین هۆنەر باسێکی گرتووە بە دەستەوە کـە باسی دیمەنی « زەڵم » و « تانجەرۆ » و « دواوان »ە ، بە رەوانـی هێناویەتە خوارەوە ، بە بێ ئەوە هیچ گرێ و گۆڵێکی تێدا هەبێ .

دیارە ئەمە ئەو « ئاشکرا ــ وضوح »یە کە قوتابخانەی رەونبێژی لێی دواوە و هەموو مەرجێکی ئەو رەوانبێژیەی تێدا هاتۆتە دی .

# زمانپاراو

ئەوە بوو وترا کە گرێ لێدان خۆی لە خۆیا ناکەوێتە بەر زانیاری ڕەوانبێـژی‌یەوە ، بەڵام باسکردنیشی لەبەر ئەو شتانە کە وتران بـو بە پێویست • هەروەها وترا « زمانپاراو » وە یا « زماندار » بۆ «فصیح» و « فصاحە » ئەگونجێن • پێویستە بەو ناوەوە کە ئێمە لە دەستووری ڕەوانبێژی‌یەوە قسەئەکەین ئەبێ توزێ بە درێژتر بزانین کە ئـەم « زمانپاراوی »یەوە یا « زمانداری »یە چی‌یەو چۆن دروست ئەبێ • هەروەها ئەم شتە کە لێرەدا باسی ئەکەین زیاتر بۆ « دوان » «خطابە»یە، بەڵام هەر بەو ناوەوە کە بابەتەکە بابەتی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی‌یـە پێویستە سەرە دەزوێکی لێ بگرین بە دەستەوە •

زمانپاراوی « وە یا « فصاحە » زیاتر ڕوو لە وشە ئەکاتـەوە • چونکە ئەگەر ئەو وشەیە ، وە یا ڕستەیە پاراو بوو ، گوزارە بە بێ گرێ و گۆڵ ئەچێتە ناویەوە •

ئەم پاراوی وە یا « فصاحە »تە چەند مەرجێکی هەیە ؟ ئەبـێ ڕەوینەوەی تێدا نەبێ • هەڵەی تێدا نەبێ ، لەگەڵ ڕێزمانی ئەو زمانە و قسەی زماندارەکانیانا جووت بێ • ئەو واژەیە مەعناکە بە پوختـی بگەیەنێ • بیانی و غەرابەی تێدا نەبێ • پێچەو دەورەو گرێ لێدراوی تێدا نەبێ •

کە ئەڵێ ڕەوینەوەی تێدا نەبێ ، واتە وشەو ڕستەکە زبرو تفت نەبن ، بە ڕەوانی لە دەم بێنە دەرەوە و گوێ گوێگر ئازار نەدەن ، وشەی

وای تێدا نەبێ کە گوێگرەکە دانی ئاڵ بێتەوە و مووچڕکی پێـــدا بێـــت ٠

کە ئـەڵێ هەڵەی تێدا نەبێ و لەگەڵ ڕێزمانی ئەو زمانە و قسەی زماندارەکانیانا جووت بێ ٠ ئەمە ئەوەیە کە تاکە تاکەی وشەکان دروست بن و لەوانە نەبن کە زماندارانی ئەو زمانە بەکاریان نەهێنابن ٠ پێچەوانەی ڕێزمانەکە نەبن ٠ بەڵای منەوە ئەم بەشەیان گرنگیەکی زیاتری هەیە ٠ چونکە لەم سەردەمەدا ـ بە تایبەتی ـ کە تا ئەندازەیەک دەست دراوە بە نووسینی کوردی‌یەوە ، وە یا لە کوردەکان ئەچنە دەرەوەی وڵاتـی خۆیان و هەندێ لە وشەی ئەو وڵاتانە دێننەوە ، تاکە تاکەی ئەو وشانە تێکڵاوی زمانەکەی خۆیان ئەکەن ٠ بە بێ ئەوە بیر لەوە بکەنەوە کـە قسەکردنیان لە شوێنێـکی‌ترایە و بەرانبەرەکەی لەوانەیە لە دوانەکەی تێ ناگا ، ئەو لەسەر قسەی خۆی هەر دەڕروا ٠ ئەمە بە ڕێی ڕاوێژی زمانپاراوی دوورە لە فەساحەتەوە بەرانبەر بەو زمانە ، چونکە ئەو زمانە کەسیەتیەکی خۆی هەیە ، ئەو بە خستنە ناوەوەی ئەو وشانە کەسیەتی زمانەکە ئەشکێنێ ! ٠

ئەمە ئەمان وا ٠ ئەمجا ئەوانەش کە نەچوونەتە دەرەوە ٠ بـەڵام دەستیان داوە بە نووسینەوە ، ئەوانەش وشەی وا ئەخەنە ناو ڕستەکەوە، کە بەرانبەر بە هیچ جۆر گوێ بۆ نازرنگێتەوە و لێی تێ ناگا ٠ ئەمەش دیسان پێچەوانەی زمانپاراوی‌یە ٠ سادەترو پاراوتر لە زمانا ئەوەیە کـە ئەهلی ئەو زمانە بە بێ گـێرەوکـێشە لێی تێ بگەن٠ ئەمەش وەکوو وترا بۆ کاتی وتاردانە ، ئەگینا نووسین ئەتوانێ وشەیەک تا ئەندازەیەک دوور نەبێ بیخاتە ناو نووسینەکەیەوە و لەگەڵیا موتوربەی بکا ٠ واتـە لەگەڵ زمانە ڕەوانەکەدا ٠

که ئەڵێ واژەکە بە پوختی مەعناکە بگەیەنێ ؟ واتە وشەکان لەوانە نەبن ـ باهەر لە ئەسڵی زمانەکەشا بن ـ وەکوو بێگانە وابن ٠ وەکوو ئەوە ئەگەر دوو وشە هەبوو ، یەکێکیان لەبەر هەر شتێک بوو خەڵکەکە تێ نەئەگەیشتن ، یەکێکیان بە تەواوی بە سەر زارەوە بوو ، خەڵک بە پوختی لێی تێ ئەگەیشت٠ ئەو ئەمەیان بەکار بێنێت، نەجێ بۆ ئەویکەیانە مەگەر لە کاتێکا نەبێ کە ئەمەی باوەکەیانی بەکار هێناوە ٠ کەچــی کوتوپڕ رستەیەکیتر دێ بە شوێن ئەو رستەیەدا ، پێویستی بـــە وشەکە ئەبێتەوە ٠ لێرەدا بۆ ئەوە دوو وشەی وەکوو یەک بە شوێن یەکا نەڵێتەوە ، ئەتوانێ وشەکەیتر بەکار بێنێ ٠ بەم ئیشەی ، نە خۆی، نە رستەکەی ، نە وتارەکەی لە پاراوی ناکەون ٠

که ئەڵێ بیانی و غەرابەی تێدا نەبێ ٠ ئەمەش ئەوەیە کە وشەکە بە پوختی گوزارەکە بدا بە دەستەوە ٠ چونکە ئاشکرایە هەر مەعنایەک تا ئەندازەیەک وشەیەکی هەیە ٠ هەتا ئەتوانێ ئەو وشەیە بەکار بێنێ ٠ کە ئەمەی کرد ئەهلی زمانەکە بە پوختیو بە بێ گیروگرفتی لێی تێ ئـەگەن ٠

که ئەڵێ پێچەو دەورە و گرێ لێدراوی تێدا نەبێ ٠ لێرەداو بۆ ئەم بەشە ئەبێ چەند شتێـک بێنینە بەر چاو ؟ ئەبێ پێچـــەو دەورەو کنایاتی وا نەهێنێتە بەرچاو کە زەین تێک بدەن و گوێگر نەتوانێ زوو مەعناکە وەر بگرێ ٠ شـتی وا نەڵێ کە چەند مەعنایەکی هـــەبێ و شاکارێکیش نەبێ بۆ بە دەستەوە نە دانی مەبەستەکەی ئەو ، شتیش زۆر دووپات نەکاتەوە ٠ نە زۆریش درێژی کاتەوە ٠ نەکورتیش ٠

لێرەدا هەر مەبەست ئەوە بوو کە باسی فەساحەت بکرێ زیاتـر بۆ دوان و وتار دان ٠ ئەگینا ئەگەر بچینە سەر حەقیقـەت ، هونەرە قسەیەکان ناچنە ناو ئەم چەنبەرەوە ٠ چونکە ئەو هونەرانە بۆ باســی زانیـارییەکە ، کە لە زمانەکەدا هەیەو بە نووسینی بۆ عیلمەکە ریـز ئەکرێ ٠

# گوزارەکاری

گوزارەکاري لە سەر رەوانکاري پێش ئەکەوێ چونکە ئەم گوزارەکاری‌یە بەچاو رەوانکای‌یەوە وەکوو کەرتێک وایە لە رەوانکاری‌یەکە ، لەبەر ئەوە پێویستە بە پێشکەوتنی .

ئەمەو لەبەر ئەوە کە بە تایبەتی لەم گوزارەکاریەدا بەرانبەری کردن لەگەڵ « مقتضی‌ی‌حاڵ » بەشێکی هەرە گەورەیەتی ، ئەمەش هۆیەکی‌تر بوو بۆ پێشکەوتنەکەی ، ئەمەش مەعنای وا نی‌یە کە لە رەوانکاري‌دا ئەم بەرانبەری کردنە نی‌یە ، لەوێشا هەیە ، بەڵام لەمدا توندو تیژترە و ئەبێ بە کلیلێکیش بۆ ئەو ، چونکە لەودا مەعنایەک بە گەلێ جۆر دێتەوە ، پێویستە لە پێشا چاورونیەک هەبێت لە باری « مقتضی‌ی حاڵ »ەوە .

دیسان یەکێکی‌تر لە ئێشی ئەم گوزارەکاری‌یە ئەوەیە کە ئاگاداریەک بە سەر وشەدا بەیدا بکرێ ؛ ئەو وشەیە کە لەگەڵ مقتضی‌ی حاڵەکەدا بەرامبەري ئەکا .

جا ئەم شتانە بوون بە هۆی ئەوە کە بابەتی گوزارەکاري پێش بابەتەکانی‌تر بکەوێ .

باسی گوزارەکاري بە چاو بەشی تێکرای بەلاغەوە باسێکی فراوانە ، ئێمە لێرەدا چەند بابەتێکمان گرت بە دەستەوە و ئەوانیترمان واز لێ هێنا .

ئەم بابەتی گوزارەکاری‌یە لە راستی‌دا هەشت لقی لێ ئەبێتەوە ؛ «ئەحوالی ئیسنادی خەبەری، ئەحوالی موسەندالیە ، ئەحوالی موسنەد ، ئەحوالی دەست و پێوەندی فعل ، قەسر ، ئینشا ، فەسڵ و وەسڵ، ئیجازو ئیتناب و مساوات » .

بەلاغەی عەرەبی ئەمانەی هەموو گرتۆتەوە ، بەڵام ئێمە لە پاش لێکدانەوە و وردبوونەوە ئەوەمان بە لاوە چاکتر بوو لەو ئەندازەیە کە باسمان کردووە زیاتر باس نەکەین . ئەوەش راستە کە بەلاغە زانیاری‌یەکە و چەمکی ئەو زانیاری‌یە لە هەموو زمانێکا هەیە ، وە ئەبێ لە زمانی کوردی‌شدا هەبێ ، بەڵام وەکوو وترا زیاد لەوە بەزیاد ئەزانم .

بەڵێ ! هەندە شت لەو باسی گوزارەکاری‌یەدا هەیە ئەتوانرێ بە مەفهوومێکی کەم هەمووی وەر بگیرێ ، وەکوو باسی خەبەر ، ئینشا ، واقع . جگە لە پێنج باسە سەرەکیەکە کە تا ئەندازەیەک بە درێـژی باسکراون .

من بەلامەوە وایە پێویست ناکا لە شوێنێکی وەکوو ئەم شوێنە ـ کە رەوانبێژی‌یە ـ وەختێکی زۆر بەوەوە خەریک بکرێ کە چۆن موسنەد نیسبەت ئەدرێتە لای موسنەد الیە ؟ بە فعل ئەبێ یا بە حەرف ، بۆ نەفی ئەبێ یا بۆ ئیسبات .

بەڵێ ! زانینی ئەمانە ئەبێ بزانرێن ، بەڵام کتێبی « نەحو » والایە بۆ ئەم زانینانە . راستە شتەکان هەن ، وێنەش هەیە ، ئەوەندە هەیە لەوانە گرنگتر هەیە ، من باسی گرنگەکانم کردووە .

وە یا لە باسی خەبەر و ئینشادا ئەمە زانیاری نەحۆ زیاتر چووەتە ناویەوە . بۆ وێنەیەکی کورت لێرەشا هەر ئەوەندە وەکوو مستێک لە-

خەروارێک ئەڵێ : « ئازاد کتێبەکەی هێنا » .

ئەمە خەبەرێکە ئەیدا ، ئەم خەبەرە دوو لا هەڵئەگرێ ؛ ئەوە هەڵئەگرێ کە راست بێ و هێنابێتی، ئەوەش هەڵئەگرێ کە راست نەبێ و نەیهێنابێ . لە کاتێکا کە راست بێ ئەمە لەگەڵ واقعدا ئایا بەرامبەری کردووە ؟ « یا نەیکردووە » بەرانبەری کردووە لە کاتێکا کەسی یەکەم – کە متکلم – چاوی بە کتێبەکە کەوتووە و هێناویەتی ، کەسی دووەم – کە مخاطبە – کە چاوی بە کتێبەکە نەکەوتبێ بەلای ئەوەوە لەگەڵ واقعدا یەکی نەگرتەوە ، بەڵکوو هەر خەبەرێک بووە و گوێ لێی بووە .

زیاد لەمەش واقع دوو جۆرە ؛ واقعێک هەیە لەگەڵ راستی و حەقیقەتی شتەکە « یەکە » ، واقعێکیش هەیە لەگەڵ دڵی قسەکەرەکەدا یەکێکە با لە راستی-شدا لەگەڵ حەقیقەتەکە یەک نەبێ . وەکوو ئەوە :

دوو کەس لە دوورەوە تاپۆیەک ئەبینن ، یەکێکیان ئەڵێ ئەوە « دار »ە ، یەکێکیان ئەڵێ « گا »یە ، وە هەر دووکیان شێرگیرن لە سەر بڕوای خۆیان ، یەعنی هەر دووکیان بە هەموو قەناعەتێکیانەوە وا ئەڵێن . ئەمجا ئەچنە سەر تاپۆکە بزانن چۆنە ؟ « ئەگونجێ دار بێ ، ئەگونجێ گابێ ، ئەگونجێ هیچیان نەبێ ، ناگونجێ هەر دووکیان بێ .

کە چوون سەیریان کرد دارە و « گا » نییە ، ئەوە واقعە بنەڕەتیەکە لەگەڵ واقعی ئەو کەسەیانا کە وتوویە « دارە » یەکی گرتەوە . واقع بە چلۆ ئەوەوە دوویانە بووەوە و بوو بە دوو واقع، یەکێ واقعی « نفس الامری » ، یەکێ واقعی بڕواکەی خۆی .

بە چاو ئەویتریانەوە کە وتبووی « گا »یە ، تا نەچوو بوونە سەر:
تاپۆکە خاوەنی باوەرری گا هەر بە گای زانیوە ، ئەگەر تەلاقی لە سەر
بخوا تەلاقی ناکەوێ ، چونکە هێشتا نەچووە تـا بۆی دەرکەوێ ئـەمە
گایە یـا گا نی‌یە . واقعی دڵی ئەو و باوەرری ئەو هەر بە گای داناوە .
بەڵکوو ئەو تاپۆیە هەر گایە تـا واقعی راستەقینە دەر ئەکەوێ .

ئەمە بەرانبەر بە راستی‌ی یەکێکیان و نەهاتنی راستی‌ی بـــۆ
ئەویتریان . ئەوە مایەوە کە ئەو تاپۆیە لەگەڵ باوەرری هیچیانا یەک
نەگرتەوە . واتە نە « دار » بێ و نە « گا » . ئەوە تـــا ئەو ساتە واقعی
هەر دووکیان راست بووە ، واقعی بنەررەتی لە پاش پەیجۆر بوونی
واقعەکەی ئەوانی بە هیچ دەر کرد .

ئەگەر خۆ جەوهەری تاپۆ هەروا بەو تاریکیە مایەوە و تەحقیـق
نەکرا ئەوە تـــا رۆژی قیامەت واقعی هەر دووکیان هەر راستە . بـــا
لەگەڵ واقعی راستەقینەشا یەک نەگرتەوە .

ئەگەر هی یەکێکیان لەگەڵ راستەقینەکەدا لە راستی‌ی‌دا یـــەکی
گرتبوو ، با ئەمانیش هەر لە سەر ئەو تاقی نەکردنەوەیە مابووبنەوە .
ئەوە واقعی ئەو یەکەیان لەگەڵ واقعی راستی‌ی یەکی گـــــرتووە .
ئەویکەشیان هەر لەگەڵ دڵی خۆیا یەکی گرتۆتەوە .

* * *

ئەمە قسەی خەبەر و واقع ، ئینجا ئینشا .

ئینشا ئەوەیە کە تۆ نالێیت وا بووە و وا نەبووە ، بەڵکوو ئەڵێی :
« ئازاد ئەو کتێبە بێنە » . ئەمە ئیتر راست و درۆیی لە قســەکەدا
هەڵناگرێ ، هەر یەک قسەیە . فەرمانێـکە و ئەڵێیت بیکە ، بیهێنێ و
نەیهێنێ تۆ فەرمانی خۆتت داوە .

لێرەدا بوون و نەبوونێـك بەرانبەر بە کەسی دووەم؛ واتە ئیجابو سەلبێـــك بەرامبەر بە موخاتەب ، پەیدا ئەبێ ؟ ئەگەر هێنـــــای ، ئەمـــرەکە بەرامبـــــەر بەو بوو بە ئەمرێکی ئیجابی ، ئەگەر نەیهێنا بوو بە ســەلبی ، هەر چەندە بەرانبەر بە کەسی یەکەم هەر ئیجابـــە ، بەڵام ئەو دوو لقەی بەرامبەر بە کەسی دووەم لێ‌ی ئەبێتەوە .

ئەگەر هات و فەرمانەکە بەرامبەر بە کەسی یەکەم سەلبی بوو . دیسان ئیجابیەت و سەلبیەت هەر روو ئەکاتەوە کەسی دووەم ، ئەوەندە هەیە سەلبەکەی ئەبێ بە ئیجاب ئیجابیەتەکەی ئەبێ بە سەلب ! . بـــە وێنە ئەگەر :

کەسی یەکەم وتی « ئازاد کـتێبەکە مەهێنە » . ئەوە هەر ئینشایە بە چاو ئەمەوە ، چونکە مەنعی کردووە لە هێنانـەکەی ، سەلبیەتێـکی تێدایە . ئەمجا ئەگەر ئازاد کتێبەکەی نەهێنا ئەوا فەرمانی سەلبیەتـــی کەسی یەکەم هاتە دی ، بەڵام بە چاو کەسی دووەمەوە ــ کە ئازادە ــ ئەو سەلبیەتە ئەبێ بە ئیجاب . چونکە فەرمانەکەی ئـەمی بەجـێ هێنـاوە ؛ ئیجابیەتی بەرانبەر بە سەلبیەتێک نواندووە . ئەگەر خـــۆ بە گوێ فەرمانەکەی نەکرد و کتێبەکەی هێنا . ئــەو وەختـــە سەلبیەتێکی نواندووە بەرانبەر بە ئیجابێـك ، واتە ئیجابی کەسی یەکەم . چونکە ئیجاب بۆ ئەمرەکەی ئەم ئەوەیە کە کتێبەکە نەهێنێ .

کەوا بوو سەلبی ئەم ئیجابی ئەوە، ئیجابی ئەو سەلبی ئەمە . بەلاغەی

زمانی عەرەبی لە سەر ئەمە بە هۆی « فعل » و « حەرف »ی نەحوی‌یەوە گەلـــێ لق و پۆپی لێ‌ی کردۆتەوە ، بەڵام من بە لامەوە وایـــە کە لە «گوزارەکاری» زمانی کوردی‌دا کورتەی درێژە پێدانەکەی عەرەبـــی

دێته سەر ئەمە و لام وایە بۆ کورد زمانێک ئەم کورتە لەو درێژە بە کەڵکترە ٠

* * *

وە یا لە باسی جێگۆڕرکێ ـ قەلب ـ لە گوزارەکاریدا ـ نەک لەباری جوانکاریدا ـ کە رواڵەت بکرێ بە پەنامەکی و پەنامەکی بکرێ بە رواڵەت هەڵگەڕراندنەوەیەک پەیدا ئەبێ ٠ بە وێنە وەکوو «نوی‌حی» ئەڵێ :

**جەنگی مەغلووبە لە دەشتی کەربەلا نەوعێکی وای لێ هات کەوا**
**ئاسمان رەنگی زەوی بگرێ و زەوی برواتـــەوە داری فەنـا**

رەنگی ئاسمان شینە ، رەنگی زەوی تۆزکارە ٠ رەنگی ئاسمانەکە بوو بە رەنگی زەوی ، واتــە لە بەر زرمە زری سواران ئەوەندە تۆز کەوتۆتە ئاسمان ، رەنگی ئەو وەکوو رەنگی زەوی لێ هاتـــووە ٠٠ هووشەکاریەکە بە جۆرێکە ، کە گوایە زەوی لە بەرچەپۆکانی ئەسپی جەنگاوەران هیچی نەماوەتەوە و لە ناو چووە !٠٠

هەروەها لە پەخشانیشا لە بەر مەبەستێـک ئەم جێ گۆڕرکێیە هەیە ٠ وەکوو ئەڵێ :

« دەوارەکە هەشت هەستوونی ئەوێ بۆ ئەوە لەنگەریان بخاتـــە سەر »» لە ئەسـلا ئەبێ بووترێ : « ٠٠ بـۆ ئـەوە لەنگەر بخاتە سەر سەریان » ئەم رستەیە بەجێ هێشتووە ـ واتە زمان ـ چووە بۆ ئـــەو رستەی پێشوو ، هێنای لە بەر ئەوە کە ئەو « سەر »ەی لابـــردووە و رستەکەی کورت کردۆتەوە ٠ ئەن ٠ جەمعەکەی پێش خستووە ٠ بەم ئیشەی هەم رستەی کورت کردەوە ٠ هەم جەسرێکیشی دروست کرد ٠ جەسرەکە ئەوەیە هەر جێ گرانایەتی خۆی هەیە بخاتە ســـەر

ئەوان ، بەڵام . بیخاتە سەریان . یا ، سەر سەریان . ئەو حەسرە نابێ بەڵکوو ئەتوانێ بەشێکی لەو لەنگەرە بخاتە سەر شتێکی تریش . تەنیا سەرەکەی ئەوان لەم بارەدا شتی تری ناخرێتە سەر و تەرخان ئەبێ بۆ ئــەو .

تا ئەم دەستورەش زمانەکە دروستی کردووە ، من و تۆ دروستمان نەکردووە ، من و تۆ تەنیا ئەوەیە لێی ئەکۆڵینەوە . دەستوور لــە سەر زمان دائەنرێ ، زمان لە سەر دەستوور دا نانرێ .

# تایبەتی

تایبەتی دوو جۆرە ؛ حەقیقی و غەیری حەقیقی • تۆ کە شتێک تایبەتی ئەکەی بە شتێکیترەوە • ئەمە یا لە راستی و « نفس الامر »دا وایە و تێی ناپەڕرێ بۆ بێجگە لەو ، یا بە هۆی ئیزافەوەیە و تێی ئەپەڕرێ بۆ شتێکیتر • ئەمە بوو بە ئیزافی و غەیر حەقیقی • وەکوو ئەڵێ : « هوشیار هەر دانیشتووە » مەبەست ئەوەیە تێی ناپەڕری بۆ وەستان « مەعنای ئەوە نی‌یە ئیتر تێی ناپەڕری بۆ سفەتێکیتری غەیری راوەستان •

هەر یەکە لە حەقیقی و غەیر حەقیقی دوو جۆرە ؛ یەکەم تایبەتی مەووسووفە بە سفەتەوە • دووەم تایبەتی سفەتە بە مەوسووفەوە • مەبەستیش بە سفەت مەعنایەکە کە لە شتێکیترا بێ ، مەبەست سفەتی قوتابخانەی « نەحو » نی‌یە •

یەکەم کە تایبەتی مەوسووفە بە سفەتەوە لە حەقیقی‌دا وەکوو ئەڵێ : « هوشیار تەنیا نووسەرە » یا « هوشیار هەر نووسەرە » • دووەم کە تایبەتی سفەتە بە موسووفەوە هەر لە حقیقی‌دا • وەکوو ئەڵێ : کەس لە ماڵا نی‌یە تەنیا نەوزاد نەبێ » « یا « هەر نەوزاد لە ماڵایە » •

ئەمجا تایبەتی مەوسووف بە سیفەتەوە لە غەیری حقیقی‌دا ؛ تایبەتی شتێکە بە سفەتێکەوە لە باتی سفەتێکیتر •

باش ئەوە تایبەتی سفەتە بە مەوسووفەوە لە غەیری حقیقـــیدا، تایبەتی سفەتێکە بە شتێکی معنەوییەوە ، نەک بە شتێکی ترەوە ، یا جێگای شتەکەی ترەوە .

جا هەر یەکە لە تایبەتی مەوسووف بە سفەتەوە و تایبەتی ســفەت بە مەوسووفەوە ئەبن بە دوو بەشەوە ؟ یەکەم تایبەتی شتێـک بـــە شتێـکەوە ، دووەم تایبەتی سفەتێـک ، یا ئیشێـک بە سفەت ، یـــا ئیشێـکی ترەوە .



بۆ زیادە روونکردنەوەی بابەت دیسان ئەڵێن :

مەبەست بەم تایبەتییە وەکوو هەر لە داررشتنی زمانی کوردیدا خۆی پیشان ئەدا ، کردەوە ، وە یا سفەتێکە هەر تایبەتی بێ بە شتێکیترەوە ، وە یا بە کەسێکەوە و لە غەیری ئەو کەسەدا بەو سۆزەوە پەیدا نەبێت .

ئا ئەم ناساندنە بەم جۆرە یەکێـکە لە هونەرەکانی رەوانبێژی و بەر گوزارەکاری ئەکەوێ . ئەمە لە دەستووری بەلاغەی عـــــەرەبی دا بە « قصر » ناو براوە .

ئەم تایبەتیەش گەلێ چەشنی هەیە ؟ یا یەکێک تایبەتی ئەکرێ بە شتێکەوە ، وە یا شتێک تایبەتی ئەکرێ بە یەکێـکەوە ، وە یا کۆمەڵێک بە شتێکەوە ، وە یا شتێک بە کۆمەڵێکەوە . دیارە ئەمە لە پەخشانیشـــا ئەبێ و لە هۆنراویشا ، ئەوەندە هەیە لە پەخشانا زیاتر بەکار هێنراوە تا هۆنراو ، چونکە هۆنراو هەندە تایبەتیەکیتری تێدایە لە پەخشانا نییە ، بە هۆی ئەو تایبەتیانەی خۆیەوە ئەوەندە پێویستی بـەم تایبەتییـــــە ناکەوێ .

ئەمجا وێنە بۆ هەندێک لەمانە وەکوو ئەوە کە ئەڵێ :

« هۆنەر ناڵی‌یە » ، « لێرەدا خاسەوێژیەک ـ کە هۆنەریەتی‌یە ـ هەر تایبەتی کراوە بە ناڵی‌یەوە ؛ واتە ئەم سفەتە لە کەسی‌ترا نی‌یە ، هەر لە ناڵی‌دا هەیە و تایبەتی‌یە بەوەوە » ، ئیتر مەرج نی‌یە کە ناڵی ئیشی‌تری نەبێت ، وە یا سفەتی تری نەبێت ، شتی‌تری هەبێ ، یا نەبێ ، سفەتێک کە هۆنەریەتی‌یە هەر بۆ ئەوە و لەکەسی‌ترا نی‌یە .

وە یا ئەڵێ :

« ناڵی هۆنەرە » ، وە یا « ناڵی هەر هۆنەرە » ، ئەمە پێچەوانەی پێشووە ، ناڵی تایبەتی کراوە بە هۆنەریەتی‌یەوە ، واتە ئیشێکی‌تری نی‌یە تەنیا هۆنەری نەبێ ، ئیتر مەرج نی‌یە کە ئەم هۆنەریە لە کەسی‌ترا نەبێت ، بەڵکوو هەر ئەو رێگەیە گیراوە کە ناڵی ئیشی‌تری نی‌یە تەنها هۆنەری نەبێ .

ئەوەندە هەیە لە کاتێکا کە وشەی « هەر » لە رستەکەدا نەبێت ، ئەو وشەیە تایبەتی‌یەکە لە رواڵەتا بتەوتر ئەکاتەوە ، ئەگەر وشەکەش نەبێ ـ وشـەی « هـەر » ـ تایبەتی‌یـەکە هەر هەیە ، بەڵام لـە رێگایەکی دوورترەوە .

یانی وشەی « هەر » لە ئەوزاری تایبەتی‌یە ، کە لە رستەکەدا بوو ، زاناو نەزان بە زانیاری رەوانبێژی چەمکەکە وەکوو یەک وەر ئەگرن ، بەڵام کە نەبوو زاناکە تـێ ئەگاو نەزانکە بـێ ئەگا ئەمێنێتەوە .

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە ئەوەش هەیە کە ئەگەر رسـتەیەکی کورت و چـەشنی رسـتە بە درێژتـر بـۆ یەک گوزارە بەکـار هێنـران ، دیـارە هی رسـتە کورتەکە باشترە تـا درێژەکە .

له سەر ئەم دەستوورە «ستەی « نالی هونەرە » مادام لەگەڵ « نالی هەر هونەرە » لە رووی رەوانبێژی‌یەوە یەک گوزارەیان هەیە ،گومانی تێدا نی‌یە کورترەکە ـ کە « نالی هونەرە » ـ چاکترە « بەڵام لەبەر ئەوە کە نەزانێک بە زانیاری رەوانبێژی درەنگتر تێی ئەگا « وە بەڵکوو وا ئەزانێ کە رستەی « نالی هەر هونەرە » زیاتر لەوانەیە گوێگر وریا کاتەوە ، ئەو بەلایەوە وایە کە ئەم بەهێزترە «

« وەستا ئەحمەد خەیاتە » هیچ ئیشێکی‌تری نی‌یە « بەڵام رێگا لە وەستا بەکر نەگیراوە کە ئەویش خەیات بێ و خەیاتی بکا •

« پیرەمێرد « ئەڵێ :

**من گوڵی سوورم بۆیە خۆش ئـــەوێ**
**مژدەی شـــەفـەقی لێ‌ی دەر ئەکەوێ**

هونەر خۆشویستنی خۆی تایبەتی کردوە بە گوڵی سوورەوە « ئیتر گوڵی سوور بـا یەکێکی‌تریش خۆشی بوێ مەبەست نی‌یـــە مەبەســـتەکە هـــەر ئەوەیە کە ئەم هیچی‌تری خۆش ناوێ تەنیا گوڵی سوور نەبێ «

وەکوو وترا ئەم تایبەتی بوونە گەلێ جۆری هەیە « بەڵام بـــە هێنانەوەی ئەو چەند وێنانە ، بـــا بۆ ئەواتیری وێنە نەهێنرابێتەوە رێگاکە پاک کرایـــەوە بۆ دەرکەوتنی جۆرەکانی تریشی هەر لەم بابەتە •

# پێکەوەنان و دابڕین

دابڕین و پێکەوەنان ئەوەیە کە رستەیەک بگێڕیتەوە بۆ سەر رستەیەکی‌تر ؛ واتە عەتفی بکەیتەوە ، وە یا وشەیەک بۆ سەر وشەیەکی‌تر •

دابڕین بە پێچەوانەی ئەمەیە ؛ واتە دابڕ‌ڕێت و عەتفی نەکەیتەوە •

لە کاتێکا کە تۆ شتێک لە شتێک دائەبڕی و عەتفی ئەکەیتەوە سەری، ئەبێ حوکمێک لە بەینیانا هەبێ کە بیانگونجێنێ بە یەکەوە ، واتە تۆ کە دووەم عەتف ئەکەیتەوە بۆ سەر یەکەم ئەبێ شتێک هەبێت کە کۆیان بکاتەوە • وەکوو ئەوە کە تۆ ئەڵێت • بەختیار ئەنووسێ و هۆنراو دائەنێ • لە نێوانی نووسین و هۆنراودا موناسەبەیەکی ئاشکرا هەیە • وە یا ئەڵێ : • بەختیار شت ئەداو نایدا • لە بەینی دان ونەداندا دژیەکیەک هەیە• بەڵام ئەگەر ئەو شتە نەبوو،عەتفەکە و لێکدابڕینەکە نابێت • وەکوو ئەوەی لێ دێتەوە کە مشک و ماسی پێکەوە بۆ حوکم کۆ بکەیتەوە ، چونکە مشک بخەیتە ئاوەوە ئەخنکێ • ماسی لە ئاو دەرچێ ئەو بە لە ئاو دەرچوونەکە ئەمرێ •

ئەگەر خۆ ئەم هاوبەشی کردنی یەکەم و دووەمە نەبوو لە حوکما • ئەوە لێکیان جیا ئەکەیتەوە و دایان ئەبڕی • دیسان ئەمەش هەر جێگای خۆی هەیە • وێنە ؛ لە کاتێکا ئەو لێت ئەپرسێ : چویت بۆ بازارر ؟ • یا نەچویت ؟• تۆ ئەڵێ : • نەوەاللە • ئەم عەتف کردنەوەیە مەعنای دابڕینی نی‌یە ، بەڵکوو هەر پێکەوە نانەکەیە ، چونکە کە وتت • نە • ئەمە وەڵامی پرسیارەکەیە کە ئەڵێی • چویت • ؟ • تۆیش ئەڵێی

« نــه » ، « و » ، كه له « وەالله »دايــه ئەمە بۆ سوێندە ، بــۆ عەتف نی‌یە ٠

هەروەها له کاتێکا که شتێــکیش عەتف ئەکەیتەوە بۆ ســـەر شتێکی‌تر ئەبێ دیسان ئاشنایەتیەك هەبێت ، ئەگەر ئەو ئاشنایەتیە نەبوو عەتفەکە بە هیچ دەر ئەچێ ٠ کاتێ که تــۆ بلێت « دانا هۆنەرە و دارا نووسەرە ٠ ئەگەر موناسەبە له نێوانی دانا و دارا دا نەبێ له دۆستایەتیا ، وە یا لە دوژمنایەتیا عەتفەکە هیچ پەیوەندیەکی نابێ ، با دانا هۆنەر بێ و داراش نووسەر بێ، بەچاو گوێگرەوە که نەیانناسێ و ئاگای له موناسەبەکە نەبێ ، رستەکە بە بێ سوود دەر ئەچێ و هیچ کەڵکێکی نابێ ٠

ئەگەر بابەتەکە یێکەوەنان بوو جوانتر بۆ ئەو شوێنە ئەوەیە کــە رستەی ئیسمی بۆ ئیسم و فعلی بۆ سەر فعل بگەرێتەوە ، بە وێنە بلێ : « نەوزاد ئەخوێنێ و ئازاد ئەنووسێ » ئەمە جوانترە لەوە که بلێ : نەوزاد ئەخوێنێ و ئەنووسێ ئازاد » هەروەها ئەگەر رستەکە کردەوەیی بوو ئەمە باشترە که بلێ : « هەررا ئەکا شێرزاد و دائەنیشێ بهزاد » تا بلێ : « شێرزاد هەررا ئەکاو دا ئەنیشێ بهزاد » ٠

* * *

بۆ زیادە روونکردنەوە :

وشەیەك تاك بێ، یا رستە ــ که ئەڵێین تاك بێ، یا رستە ، واتە ناو بێ نەوەك کردەوە ، چونکە کردەوە با ، لەرواڵەتیشا یەك وشە بێ ، بەڵام له راستی دا زیاتر له وشەیەك دەر ئەچێ ، که زیاد بوو ئەبێ بە رستە ــ

یا ئەمەیە له گوزارەدا ئەگێرــرێتەوە بۆ ئەوەی پێشەوەی، واتە له حوکما عەتفی ئەکەیتەوە بۆ لای ئەو و ئەیانکەی بە هاوبەش ، یا ئەم نیشە ناکەی ٠

ئەگەر کردت ئەمە پێکەوەت نووساندن ، ئەگەر نەتکرد ئەمە لێکت دابڕرین ، واتە « وصل و فصل »ت کرد • ئەبێ ئەوەش بزانــرێ کە دابــڕرین بناغــەیی‌ترە تا پێکەوەنان • چونکە پێکەوە نانەکە روو تووشێکە بە سەر دابڕرینەکەدا دێت •

لە شێوەی هەموو زمانێکا ئەم دەستوورە باوە و هەیە • زمانــــی کوردی ــش یەکێکە لەو زمانانە کە ئەم تەحرە شتەی تێدا ئەبێت •
رەوانبێژي ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم بابەتەدا بۆیە هەیە چونکە چەمکێکی زانیاري ئــەو زمانە دەر ئەخا ، لە دەرخستنەکەی کەسیەتــی زمانەکــە ئەدا بە دەستــەوە •

ئەمجــا دیســان وێنە بــۆ هەندێک لەمانە وەکوو ئەڵێ :

« نــەوزاد و بهزاد و تارا چون بۆ قوتابخانە » • ئەو ســێ کەســە هــاوبەش بوون لە کردەوەیەک دا ــ کە چوونیانــە بۆ قوتابخــانە و فێرگە ــ لەبەر ئەمە هەر سێ‌کیان پێکەوە ئەڵێت و پێکیانــەوە ئەبەستیت • بەڵام لــە کاتێکا کە ئەڵێت : نــەوزاد هەستا ، بهزاد دانیشـــــت ، تارا خوێندی • • لەبـــەر ئەوە کە هاوبەشیەک نی‌یـــە لە نێــوانی ئــەو دەستەیەدا ؟ واتـــە حوکمێک لە ئارادا نی‌یە کە پێکیانەوە بــەستێت نایانگێڕیتەوە بۆ سەر یەک ، بەڵکوو هەر یەکە بە جیا حوکمــی خۆی ئەدەیتێ ، ئــەمە بوو بــە دابڕرین و ئاشنایەتی‌یان ئیتر پێکەوە نەبوو •

لە دەستــووری پێکەوە نان و دابڕرین‌دا گەلی لقی لی‌ی ئەبێتــەوە ، سا ، یــا بە هۆی راناو • وە یــا پاشکۆ ، وە یا ســـفەت ، وە یــا یەک‌بوونی مەوسووف کە هەر یەک لەمانە ئەگونجێ هاوبـــەش وە یا سەر بەخۆ بن •

پاکژی‌ی بابـه‌ته‌که دێته سه‌ر ئه‌وه که هه‌ر یه‌ک له‌م شتانـه ؟ واته له دوو رسـته‌ی ئه‌م شـتانه ، یا پێکه‌وه ئه‌به‌سترێن ، یـا لێک جیـا ئه‌کرێنه‌وه • وێنـه‌کانی سـه‌ره‌وه کلیلێکن بۆ خستنه سه‌رگازی پشـتی ده‌روازه‌ی گشت بابه‌ته‌کانی پێکه‌وه نان و دابرین •

ئه‌و که‌سـانه‌ی که تـا ئه‌م شوێنه سه‌ریان بردۆته ناو ئـه‌نجومه‌نی ره‌وانبێژی‌یه‌وه ، وه به تایبه‌تی بابه‌تی پێکه‌وه نان و دابریـنه‌وه ، لام وایـه بابه‌ت ئه‌وه‌نده ئاشکرایی تێدا هه‌یه که زۆر که‌م بۆ چه‌سپاندن و بته‌و کردنی ، پێویست به زیاده‌وێنه بن و وینه‌ی‌تریان بۆ بهێنرێته‌وه •

# تیل نیگا

تیل نیــگا یەکێکە لە هونەرەکانی رەوانبێژي و پاشان گوزارەکاري•
تیل نیگا ئەوەیە کە بەتیلی چــاو سەیری شتێک بکرێ • ئـەم تیلەش ئەبێ « چــاو »لەناو چاودانەکەدا تۆزێ بجوولێ و لا بکاتـــەوە ، وە یا گەردن کەمێــک لا بکاتــەوە بۆ ئەوە بتوانێ ئــەو تیل نیگایە دروست بــکا •

ئەم چەمکە لــە بەلاغەی عەرەبي دا بە « التفات » ناو بــراوە ، چونکە التفات لاکردنەوەیە بەلای راست و چەپا • من لام وایە تیل نیــگا ئەو مەعنایــە زۆرتر پرر ئەکاتەوە ، چونکە لە تیل نیگادا لاکردنــەوەی چاو و گەردن هەردووکی تێدا هەیە •

تیل نیگا لە زانیاري رەوانبێژي دا ئەوەیە کە کەسی یەکـەم و کەسی دووەم و کەســـی سێیەم هەیە ، واتە « متکلم ، مخاطب ، غائب » • رستەیەک دێتە پێشەوە • سەرەتای رستــە ـ بە وێنە ـ بابەتەکەی ، کەسی یــەکەم دانراوە ، بە شوێن ئەودا رستە وە یا شتێــکی تر دێت و پەیوەندي ی بە رستەی یەکەمەوە هەیە ، لەوەدا کە هەر ئــەبێ گوزارشت بۆ کەسی یــەکەم بێ ، کەچی لە رستە دووەمەکەدا گوزارشتەکە بـــە کەســـــی دووەم ، وە یا سێیەم لێی ئەدرێتەوە • هــەروەها دووەم بە یەکەم ، وە یــا یەکەم بە سێیەم ، وە یا سێیەم بە یەکەم •

ئەو هۆیەش کە ئەم تیل نیگایە دروست ئەکا ئەوەیە کە پیـاو ئەگەر لە شێوەیەکەوە چوو بۆ شێوەیەکی تر ، گەشەو خۆشیەکی زیـاتر روو

ئەکاتـــە گوێگرەکە و زیاتر ئەبێتە هۆی ئـەوە کە گوێ بـــۆ قـەکە بگرێ •

جا وێنەش بۆ ئەمانە ، یەکەمیان وەکوو « نالی » ئەڵێ :

**« نالی ئاســـوودە نییە توولی تەمـــامی عـومـرت »**
**« بە نەفەس دێت و دەچێت نەسلی لە سەر باییکە »**

لە کەسی سێیەمەوە هاتووە بۆ کەسی یەکەم ـ لە غائبەو هاتووە بۆ متکلم ـ ئەبوا بوترایە :

**« نالی ئاســـوودە نییە توولی تەمـــامی عـومـری »**

کەچی لای داوە و ئەڵێ « عومرت » •

ئەمە بە مەرجێـک وایە کە سەرەتای رستەی وشـــەی « نالی » نەبێت بە بانگ‌کراو « منادا » و ئەوزاری بانگ کردنەکەی لـێی فرێ درابێ ، واتە نەبێ بە « ئەی‌نالی » ، وە واشی لێ ناکەین ، چونکە هێنانی ئەو ئەوزارە « تأویل »ە ، تیل نیگاکە ، جوانترە لەو تأویلە •

وە یا وێنە بۆ ئەوە کە لە کەسی یەکەمەوە بچی بۆ کەســـی دووەم ـ لە متکلمەوە بۆ مخاطب ـ وەکوو « مەحوی » ئەڵێ :

**زەمانەی پرر تەعەب ئەتکاتـــە تـــیرۆک**
**لەتێ نانت دەداتێ دوو بەشـــــــی نۆک**

هێناویە لەخـۆی ، نەفسی خۆی جیا کردۆتەوە و کردوویە بـــە کەسی دووەم ـ مخاطب ـ وای پێی ئەڵێ • ئەمە لە ئەسـڵا ئەبوایە وا بوایە کە بڵێ :

« زەمانەی پرر تـەعەب ئەمکاتـە تیـرۆک » لەتێ نانم دەداتێ دوو بەشی نۆک » • لـــە کەسی یەکەمەوە چووە بۆ کەسی دووەم • ئـــەم بازدانەش باقی هۆنراوەکانی دوایی دەری ئەخا ، بەتایبەتی هەر بە شوێن ئەوا ئەڵێ :

**پیاڵەی دیـــدە لەبرڕێــزە دڵا تـۆش**

**بجۆشە ، سازی ناڵە هەم ببێ کۆک**

وە یا وێنە لە کەسی سێیەمەوە بۆ کەسی دووەم ـ لە غائبەوە بۆ مخاطــب ـ وەکوو « کوردی » ئەڵێ :

**پێم دەڵــێ کوردی وەکوو من ئارەزووی وەسڵی نی‌یــە**

**بۆچی تۆ مانــع دەبــی ، ئەم بەندە چۆن بێجا ئــەکا**

ئەمە لە ئەسڵا ئەبێ وا بێ کە بڵێ :

**« پێم دەڵێ کوردی وەکوو من ئارەزووی وەسڵی نی‌یە »**

**« بۆچی ئەو مانع دەبێ ، ئەم بەندە چۆن بێجــا ئەکا »**

لە « ئەو » کە غائبە بازی داوە بۆ « تۆ » کە مخاطبە .

ئەمە لەبەر تیل‌نیگاکەیە ، لادانەکەش دیارە ، چونکە ناڵێ «پێت وتم» وە لە رستەی « کوردی » بە دواوە قسەکەی ئەوە .

ئەگەر ئەو بیوتایە «پێت وتم» هیچ تیل‌نیگایەک لە ئارادا نەئەبوو ، چونکە « پێت وتـــم » ، واتە « تۆ » هەر دووکی بۆ کەسی دووەمــە . بەڵام رستەی « پێم دەڵێ » دیارە بۆ کەسی سێیەم و غائبە ، کــەچی لــە نیـــوە هۆنراوەی دووەمدا ئەڵێ « تۆ » ئەوە ئیتر لای‌دا .

# کورت بڕی و درێژبڕی

مەبەست بە کورتبڕی ئەوەیە کە کۆمەڵە گوزارەیەک بە چەند وشەیەکی کەم دەر ببڕدرێ . درێژبڕی پێچەوانەی ئەمەیە .

ئەمە راستە کە وشە ، وە یا کۆمەڵە وشەیەک ـ با هەر چەندە درێژیش بێ ـ ناتوانێ بە تەواوی گوزارشت لە گوزارەکە بداتەوە ، بەڵام ئەم دەستوورە کە ئەوترێ و دائەنرێ ـ دەستووری کورتبڕی و درێژبڕی ـ ئەمە شتێکی نیسبی‌یەو و اعتبارات دروستی ئەکا .

ئەمەو دیسان هەموو زمانێک ئەو رەخنەیە رووی تێ ئەکا کە وشە ناتوانێ بەرەنگاری گوزارە بێتەوە بۆ ئەوە بە تەواوی دەری ببڕێ . زمانی کوردی‌ش وەکوو ئەوانیتر رەخنەکە رووی تی‌ی ئەکا . بەڵام وەکوو ئەمە رووی تێ‌ی ئەکا ئەوەش هەر رووی تێ‌ی ئەکا ؛ بەو ناوەوە کە زمانە ئەبێ کورتبڕی و درێژ بڕریشی تێدا هەبێت ، چونکە ئەمە یاسایەکی تێکڕایی‌یە بەچاو هەموو زمانێکەوە .

جا ئەو کورتبڕی‌یە یا تەماشای پیتەکانی ئەکرێ ؟ واتە دوو رستە هەیە بۆ دەربڕینی گوزارەیەک ، بزانی کام لە رستەکان پیتەکانی کەمترە ، دیارە ئەوەیان کورترە .

وە یا تەماشای وشەی رستەکان ئەکرێ کە کامیان وشەکانیان کەمترە ، دیارە ئەوەیان کورترە .

وە یا تەماشای فراوانی گوزارەکە و لەچاو ئەوا زۆر کەمی‌ی وشەکان ئەکرێ ، دیارە ئەمەش هەر کورترە .

کورتبڕیش لە سەر دوو جۆرە ؟ یا ئەمەیە هیچ شتێک لە رستەکەدا لانەبراوە ، وە یا لێی لابراوە .

که ئەڵێن لابراوە ، وە یا نەبراوە ، زمانەکە خۆی ئەو دارڕشتنەی کردووە ، پاشان ئەوە بووە بە ڕێباز بۆ هەنگاو نانی ڕەوانبێژی بە سەریا .

ئەوەی کە لانەبراوە وەکوو ئەوە ، کابرا لێیان پرسی، هەمەوەندەکان چییان کرد ؟» وتی :

« هاتن ، کوشتیان ، بردیان ، سووتاندیان »

ئەمە ڕستەیەکی کورتە ، بەڵام گوزارەیەکی زۆری گرتۆتە خۆی ، چونکە بێجگە لەوە کە کوشتن بۆ پیاوەکان و بردن بۆ مەردەماڵ و ماڵاتەو سووتان بۆ دەغڵ و دانە . ئەگەر بێت و بویسترێ بە فراوانی قسەی لێوە بکرێ قسەیەکی زۆر و « ڕاڤین ـ شەرح »ێکی ئیجگار فراوانی ئەوێ .

ئەو ڕستەیەش کە لێی لابراوە ، ئەو بەگەلێ چەشنە ، بەڵام ئێمە لێرەدا کە وێنەیەک ، دوو وێنەمان هێنایەوە ئەتوانرێ دەستوورە گشتییەکە بە هۆی ئەوانەوە بێتە دەست .

وەکوو ئەوە کە ڕێبوارێک پرسیاری شتێک لە یەکێک ئەکا ، ئەویش پێی ئەڵێ : « من نایزانم بچۆ لەو دێیە بپرسە » مەبەست بە « لەو دێیە بپرسە » ، واتە لە « خەڵکی » ئەو دێیە بپرسە .

وە یا کابرا ئەچێتە لای زیندروو ئەڵێ « زینێکم بۆ دروست بکە ، واتە زینێک بۆ «ئەسپەکەم » دروست بکە .

ئەوەش کە تەماشای پیتەکانی ئەکرێ ، وەکوو ئەڵێ :

« کەوا سووری بەر لەشکر »

« باڵا بەرزی کڵاو سووری پێش لە شکر »

دیارە پیتی وشەکانی ڕستەی یەکەم کەمترە لە هی دووەم ، لەگەڵ ئەوەشا کە هەردوو ڕستەکە یەک گوزارەیان هەیە .

بەرانبەر بە کورتبرری « درێژبرری » هەیە ، ئەمەش ئەوەیە ئەو مەبەستە لە باتی ئەوە بە رستەیەکی کورت بدرێ بە دەستەوە ، درێژی ئەکاتـــەوە بە مەرجێ لـــە درێژکردنەوەکەدا وەنەبێ هونـــەرێـکی رەوانبێژي پەیدا ببێ .

وێنەکە وەکوو ئـەوە : کابرا باسی زەویەکی بەیاری ئەکا ، کـە بە بەیاري ماوەتەوە ، ئەڵێ :

« سەپان نەبوو بۆ شۆو بررین ، گا نەبوو جووتیار جووتی پێ بکا ، باران نەبوو ئاوی بدا ، وا بەو جۆرە بەبەیاري مایەوە » .

کابرایەکی گوێگر گوێ لەم قسەیە ئەبێ ئـەڵێ :

ئەوەی پێی ناوێ بڵـــێ « نەکێڵراوە ! . . » . دیارە قســـەی کابرای پێشوو بە تەواوي بە درێژبرری دەرچوو .

لەگەڵ ئەمانەشا کورتبرری چەندە چـــاکە ، درێژبرريـــش تـا ئەندازەیەک ئەو چاکەیە تێدا هەیە ، چونکە شوێنەکە ئەیەوێ . لەپاشا ئەمە اعتباراتـــە ؛ هی وا هەیە نەزانە تاشتێکی زۆری بۆ نەڵـێت لێی تێی نـاگا . بـــەڵام بابەتی کورتبرری و درێژبرری بۆ ئەهـــلی بەلاغەیە . یـەک ، دووەم بـۆ دەرخستنی قسەو گفتو گۆی ئـەو زمانەیـە کە تا چ ئەندازە لەگەڵ بەلاغەتا رویشـتووە ، وە تا چ ئەندازە هێزو پێزی ئەو زمانە هەیە .

دیسان ئەبێ ئـەوەش بزانرێ کە ئەم کورتبرری و درێژبررییە بۆ پەخشـانە و هیجیتـر ، چونکە هۆنراو خۆی بە ســروشت ئەبـــێ کورتبرري تێدا هەبێ ، ئەگەر لەم رێگایە لایدا نە هۆنراوە ، وە نە بە هۆنراو دائەنرێ .

# ٧ ڕەوانکاری

## هونەرە قسەییە ئاشکراکان

وەکوو وترا رەوانبێژي بە تێکرایی‌لەو هونەرانە دروست ئەبێ ، ئەوانیش لە ناو خۆیانا بوون بەو سێ بابەتەی پێشووەوە ؛ ـ گوزارەکاري ، رەوانکاري ، جوانکاري ـ . باسی گوزارەکاري پێش خرا و تا ئەندازەیەک قسەی لێوە کرا ، ئێستە دێنە سەر بابەتی « رەوانکاري » .

بۆیەش گوزارەکاري لە سەر رەوانکاري پێش خرا ، چونکە گوزارەکاري وەکوو « پاژ »ێکە لە رەوانکاري ؛ لەوێدا ئەبێ ئەوە بهێنرێتە بەر چاو کە شتەکە لەگەڵ چۆنیەتی وەختەکە « مقتضی‌ی‌حاڵ » دا بەرانبەري بکا ، لە رەوانکاري ـ شدا ئەوە هەر هەیە و زیاد لەوەش شتێکی‌تر هەیە ؛ کە تۆ لێرەدا یەک گوزارە دێنی و ئەیبری بە سەر گەلێ شتدا . لەمەوە وەک‌یەک ، درکە ، خوازە ، خواستن و شتی‌تر دێتە کایەوە .

یاسایەکی زانیاري « منطق » هەیە کە لە هەندێ شوێنا « هاماو » و « پاژ » ؛ واتە « کلی‌و جزئی » باس ئەکا ، بوونی هاماوەکە بە بوونی پاژەکەوەیە ، لە گشت پاژەکان هاماوەکە دروست ئەبێ . ئەم باسی رەوانبێژي و بەشەکانی ، وە یا بڵێین هونەرە قسەیە ئاشکراکانیش واتە ؛ بوون و نەبوونی رەوانبێژی‌یەکە بە بوون و نەبوونی بەشەکانیەوەیە ، هونەرە قسەیە ئاشکرکان تێکررا بەو بەشانەن .

ئەمەش مەرج نیﻴە کە ئەگەر بوترێ : ئەم رستەیە گوزارەی رستە عەرەبیەکەیە ـ کە فنونی بیانیەیە ـ ، فنوونی بەیانیەش هەموو بەلاغە ناگرێتەوە ، بەڵکوو بەشێ لە سێ بەشەکەی ئەگرێتەوە .

ئەمە مەرج نیﻴە بوترێ ، چونکە هەر زمانێ کەسیەتی خۆی هەیە ، هەر وشە وە یا رستەیەک لە زمانێکا گوزارەیەک ئەدا بەدەستەوە کە لە زمانێکیتردا دوور نیﻴە ئەو شتە بەو جۆرە نەبێت .

لە باوەرری منا ، لە زمانی کوردیدا رستەی « هونەرە قسەیە ئاشکراکان» لە باتی ئەوە بەشێک لە سێ بەشەی رەوانبێژی بگرێتەوە ـ وەکوو لە عەرەبی دا « بەیان » هەر تەنیا یەکێ لە سێ بەشەی بەلاغەی گرتۆتەوە ـ هەمووی گرتۆتەوە . بەو بۆنەوە ئەچینە ناو جەرگەی باسەکانەوە و ئەڵێین :

# وەک یەک

یەکێک لە هونەرە قسەییە ئاشکراکان « وەک‌یەک ـ تەشبیە ».

کەڵک لە وەک‌یەک‌دا ئەوەیە کە شتێک هەیە ، ئەو شتە بەلای تۆوە ئاشکرا نی‌یە و نایزانی ، ئەو کەسە کە قسەت لەگەڵ ئەکا دێنێ ئەو شتە ئەچوێنێ بە شتێک کە ئەوەیان بەلای تۆوە ناسراوە و ئەیزانی .

کەوا بوو « وەک‌یەک » بۆ هەڵدانەوەی پەردەیە لە سەر شتێکی نادیار ، ئەمەش بۆ ئەوە کە شتی نادیار لە ئارادا نەمێنێ و ئاشکرایی بێتە مەیدانەوە .

وەک یەک چوار هەستوونی ئەوێ بۆ ئەوە لەنگەریان بخاتە سەر « یەکەم « لێ‌ی‌چوون » » دووەم « لەوچوون » « سێ‌یەم « لێکچوون » » چوارەم « ئەوزار « واتە ؟ » مشبە ، مشبەبە » وجەالشبە » ادات » .

هەر چەندە مەرج نی‌یە کە ئەم چوارە هەموویان لە رستەکەدا هەبن ، بەڵام نابێ خاڵی بێ لە هەموویان ، وە یا لە هەندێکیان . بەڵکوو وەک یەک‌ێ کە هەر لێ‌ی چوون و لەوچوونی تێدا هەبێ ئەوە لە هەموویان بەهێز ترە .

ئەوزار کە « ادات » لە زمانی کوردی‌دا ئەمانەن :

« وەک ، گوایە ، گۆیا » چما » ئاسا ، ئەڵێی » . «چەشن ، وێنە ، تەرز ، چون »یش بەکار ئەهێنرێ .

ئەمجا ئەو وەک یەکەی کە هەر چوار پایەکەی تێدا هەبێ وەکوو ئەم هۆنراوەی « کوردی » کە ئەڵێ :

**دێ بە تاو ئەشکی دووچاوم هەر وەکوو دجلە و فورات**
**مەزرەعەی غەم سەوز و تێراوە لە بەر ئەم دوو شتە !**

« دجلـــە و فورات » لەوچوونە ، « ئەشکی دووچـــاو » لێی چوونە ، « تاو » لێکچوونە ، « وەکوو » ئەوزارە ·

وێنە بۆ وەکیـــەکێ کە سێ پایەی تێدا هەبێ وەکوو ئـــەم هۆنراوەی « ئەحمەد موختار » کە ئەڵێ :

**هیلالی یەکشەوەم دی سەجدە بەر بووم بێ تامڵ من**
**موبارەک بوو لە لام چونکە ئەڵێی تاقی برۆی یارە !**

« برۆی‌یار » لەوچوونە ، « هیلال » لێی چوونە ، « ئەڵێی » ئەوزارە ·

وە یا هەر ئەو ئەڵێ :

**بەخوا شیشەی دڵم دایم لە بارەی عەشقی تۆ کەیلـــە**
**لە داخی سەروی باڵات ئەشکی چاوم هەر وەکوو سەیلە**

« سەیل » لەوچـــوونە · « ئەشکی چاو » لێی چوونـــە · « وەکوو » ئەوزارە ·

ئەوەی کە سێ هەستوونی هەبێ و ئەوزار نەبێ وەکوو « ناڵـــی » ئەڵێ :

« **عاشقی بێ دڵ دەناڵێ مەیلی گریانی هـــەیە** »
« **بێشکە هەورە تریشقە تاوی بارانی هـــەیە** »

« هەورە تریشقـە » لەوچوونە · « گریان » لێی چـــوونە · « دەناڵێ » لێکچوونە ·

وەک یەکێ کە هـەر لێی‌چوون و ئەوچوونی تێدا هەبێ دیسـان هەر وەکوو « ناڵێ » ئەڵێ :

**« سەهمی نگەهت خستمی هەستامەوە رامکرد »**
**« ئەگریجە و زولفت بە جـەفا هاتنە یــاری »**

« نگەهت » لەوچوونە « « سەهم » لێی چوونە «

لە هەموو بەشەکانی وەک یەکدا « لێکچوون » با راستەو راست لە رستەکەدا زەق نەبوو بێتەوە لە راستی دا هەر هــەیە و ئەبێ هەبێ ، چونکە هەر ئـــەوە کە لەوچوون و لێی چوونەکەیێکەوە ئەبەستێت «

ئەمەو هــەر چەندە وتراوە وەک یەکێ کە تەنیا هــەر لەوچوون و لێیچوونی تێدا هــەبێ ئەوە لە هەموویان بەهێزترە ، بــەڵام ئەمە بــە چاو چوار بەشەکــەوەیە ، ئەگینا وەک یەکی هەڵەو گەرراوە هـــەیە کە لەوچوون ئەکــرێ بــە لێیچوون و لێیچــوون ئەکرێ بــــە لەچوون ئەمە لە هەموو وەک یەکێ بەهێزترە ، با ئەوزاریشی تێدا هەبێ « وێنە وەکوو « مەولەوی « ئەڵێ :

**« گوڵ چون رووی ئازیز نەزاکەت پۆشـــــان «**
**« وەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشـــــان »**

لە هەموو وەک یەکێــکدا رووم‌ەتی ئازیزو یار ئەچوێنرێ بــە گوڵ ، وە فرمێسکی خۆشی و شادی ــ کە ساردە ــ ئەچوێنرێ بە بەفراو، کەچی ئەم هەڵگــێرراوەتەوە ئەڵێ : نەزاکەت و نــازکیی گوڵ وەکوو رووی ئایزە ، هاژەی بەفراوان وەکوو لافاوی چاوی منە « ئەمە لێرەدا ئەو پەرری بەلاغەی نواند ! «

* * *

ئەنجام و روونکردنەوەیەک

مەبەست بە وەک یەک ئەوەیە کە خواستنی « تحقیقیة « مکنیة ، تجریدیة » نەبـێ ، چونکە لەم سێیەدا هاوبەشی کردنی فرمانێــکە لەگەڵ فرمانێــکیترا لە گوزارەدا ، واتە « لێــکچوون » ، لەگەڵ ئەوەشا ئەمانە هیچیان بە وەک یەک دانانرێن «

وەکوو وترا لە وەکیەک دا چوار هەستوون هەیە ؛ لێی چوون ، لەوچوون ، لێکچوون ، ئەوزار •

لە کاتێکا کە ئەڵێین : لێیچوون و لەوچوون ـ کە ئەم دووە هەر دوو سەری وەکیەکەکەن ـ « حسی »بن ، وەکوو : « روومەت ، گوڵ ، پێستی نەرم و نیان، شەرابی ئاڵ و گەش » وە یا « عەقلی »بن، وەکوو « زانین ، ناسین ، ژیان » ، وە یا جیا بن ؛ واتە لێی چوونەکە عەقلی بێ و لەو چوونەکە حسّی بێ وەکوو « مردن ، درزندە » ، دیارە مردن عەقلیە و درزندە حسّییە • وە یا پێچەوانەی ئەبێ ، واتە لەو چوونەکە عەقلی بێ • لێی چوونکە حسّی بێ ، وەکوو « بۆن » و رەوشتی چاک کە ئەمانە عەقلین •

مەبەست بە « حسّی » ئەوەیە کە خۆی یا « مایە ـ مادد »ەکەی بەچاو ، یا گوێ ، یا بۆنکردن ، یا چەشە ، یا دەست لێدان پەیدا بێ • لەبەر ئەمە ئەوی بە ئەندێشەش پەیدا بێ هەر لەمانەیە و تێکلاویان ئەبێ •

بەڵێ راستە خەیاڵ خۆی بارسایێکی نییە و لە مەحسووسات نییە ، بەڵام ناوەرۆکی خەیاڵەکە ؛ واتە ئەوشتانە کە لە خەیاڵەکە دروست بوون لەوانەن کە بە « حسّ » هەست ئەکرێن •

وێنە وەکوو هۆنەرێکی شارەزووری ئەڵێ :

**« گوڵاڵە سوورەی دەشتی «بێرەشکە»[1] »**
**« کە « با » لێی ئەدا ئەکا کەروێشکە »**

**« سووریەکەی ئەوان بەو شەپۆلدانە »**
**« ئەڵێی یاقووتە و لە ناو گەردانە ؟»**

سووریە کە چوێنراوە بە یاقووت ، یاقووت ، لەو چوونە و مەحسووسە

(١) ـ « بێرەشکە » دێیکە لە شارەزوور •

ـ ئەسڵی سووریەکە ، نەوەک گوڵەکە ، چونکە جەوهەری سووری عەرەزێکە بە سەر ‌• مایە «کەوەیەکە ئەسڵی گوڵەکەیە ـ ئەم ئەسڵی سووری‌یە خەیاڵی‌یە و غەیر مەحسووسە و لێ‌ی چوونە ، تەماشا ئەکەی غەیر مەحسوسێک چوێنراوە بە مەحسووسێک •

مەبەستیش بە عەقڵی ئەوەیە کە وەرگرتنەکەیان بەهۆی پێنج هەستە رواڵەتیەکانەوە نەبێ ، بەڵکوو بە هۆی حەواسە پۆشراوەکانەوە بێ• ئەوەی کە بە وژدان هەستی پێ‌ی بکرێ ئەچێتە ناو عەقڵیەکەوە ، وەکوو خۆشي و ئێش و ئازار •

ئەمجا لێکچوون :

لێکچوون شتێکە کە لێ‌ی چوون و لەوچوون تیایا هاوبەشن ؛ واتە لەو مەعنایە دا کە ئەویسترێ هەر دوو تەرەفەکە تیایا هاو بەش بن • کە ئەڵێین هاو بەشن ؛

یا ئەمەیە بە هیچ جۆر لە حەقیقەتی لێ‌ی‌چوون و لەو چوونەکە دەر نەچوون ، وەکوو کەوایەک ئەچوێنی بە کەوایەکی‌تر لە ترۆم و رەگەزیانا • بە وێنە ئەڵێ : هەر دووکیان قاسۆنن •

وە یا دەرچوون ، واتە دروستکردنەکەی بە ئەندێشە دروستکراوە • وەکوو لەم وێنەدا • ناری » ئەڵێ :

**• جریوەی ئەستێرەی ئاسمان لە شەوێکی ساف و تاریکا »**

**« نەڵێی رێبازی ئەهلی بدعەیە بە ناو رێگایکی باریکا »**

ئەمە وێنەیە بۆ ئەوە کە لێ‌ی چوون و لەوچوون لە شتێکی خەیاڵی‌دا هاوبەش بن ؛ یەعنێ ئەم مەعنا خەیاڵی‌یە نە لە هیچ‌یەک لە دوو تەرەفەکەدا هەیە ، وە نە لە هەردووکیشیانا هەیە • مەگەر بەوە نەبێ کە ئەندێشە دروستی بکا •

لێرەدا جـریوەی ئەستێرە لێ‌یچوونە ، « ڕێباز » لەوچـوونە « جریوەی ئەستێرەی چواندووە بە ڕێبازی ئەهلی بدعەت ، لێـکچوون « واتە ئەو شتەی کە دوو تەرەفەکە ئەگەیەنێ بـە یـەک « ڕووناکي و ڕێ‌پێشاندانی مەعنـەوی‌یە ، ئەمە لە ڕێبازەکەدا خەیاڵی‌یە ، چـونکە سپێتی و ڕووناکـي و تاریـکي چواندووە بە داهێنانی شـتـی نابەجێ لە دینا ـ کە ئەوەش ڕێـگای ئەهلی بدعەتە « لێـکچوون ـ کە کـۆ کەرەوەی دوو تەرەفەکەیە ـ خەیاڵی‌یە لە داهێنانەکەدا «

وە یا بە هۆی سفەتێکەوە لەو حەقیقەتە دەرچوون ؛ واتـە سفەتێـک لە لێ‌یچوون و لەوچـوونەکەدا هەیە ، پێویسـتە لێـکچوونەکە لەو سفەتەدا لەگەڵ ئەوانا هاوبەش بێ «

جا ئەم سـفەتەش یا حەقیقی‌یە ، یا ئیزافی‌یە ، حـەقیقیەکەش یـا ئەمـەیە حسّی‌یە ، ؛ واتـە بە یەکێ لە پێنج هەستە ئاشـکراکان دەر ئەکەوێ و وەر ئەگیرێ « وە یـا عەقلی‌یە ، وەکوو : زیـرەکي و زانیاري و لێبوردن « ئەو سفەتەش کە ئیزافی‌یە ؛ واتە لێـکچوونەکە سفەتێـکی ئیزافی‌یە و لـەزاتی «بابەت ـ موضـوع »ەکەدا نـی‌یە « بەڵکوو مەعنایەکە بەستراوە بە دوو شتەوە « وەکوو تەشبیهی دەلیـل ئەکرێ بـە ڕۆژ « تەماشا ئەکەی ئەم لابردنـی پەردەیە شتێـک نی‌یە کە لە زاتی دەلیلەکە ، وە یا ڕۆژەکەدا بێ ، بەڵکوو ئەمە مەعنایەکـی ئیزافی‌یە ؛ ئیزافە ئەکرێتـە لای دەلیلەکە « وە یا ڕۆژەکە « وە یـا ئەلای نەفسی پەردەکە «

بە کورتی ئەم لابردنی پەردەیـە لە بەینـی دەلیـــل و ڕۆژ و پەردەکەدایە ، کە ئەوان نەبن ئەم نابێ ،

* * *

ئەنجام ئەوەیە ؟ لێکچوون ـ وجە الشبە ـ یا یەکێکە لە جێگای یەکێک دانراوە وەکوو ئەوە ئەڵێ « ئازاد وەکوو نەوزاد وایە » چواندنی ئەم دووە بە یەک لەوەدایە کە هەردووکیان لە رەگەزەکانی مـاددە ـ ئاو و خاک و باو ئاگر ـ دروستکراون ۰

وە یا زیاترە لە یەکێک ۰ ئەوەی کە وا یەکێکە ، وە یا لـە شوێنی یەکێک دانراوە » یـا ، ئەمەیە بە حَس و هەست وەر ئەگیرێ » وە یا بە عەقڵ مـرۆڤ هۆشی بۆ ئەچی ۰ واتە دەرک ئـەکرێ ۰ ئەمە چوار لق ۰

ئـەوەی کە زیاترە لە یەکێـک یا حسّیە ، یا عەقڵیە ، یـا جیاوازییان هـەیە ، واتە اختلافیان هەیە ۰ ئەمە بوو بـە حەوت ، سێیە عەقڵیەکە دوو تەرەفـەکەی ـ لێی چوون و لەو چـوونەکەیە ـ یـا حسّی ئەبن یـا عەقڵی ئەبن ۰ یالێی چوونەکە حسّـی ئەبێ و لەوچوونەکە عەقڵی ئەبێ » وە یـا لێی چوونەکە عەقڵی و لـەو چوونەکە حسّی ئەبێ ۰ ئەمە هەمووی بوو بە شانزە بەشەوە ۰

لەگەڵ ئەم هـەموو شتانەدا و لەگەڵ ئەم هەموو بەشـکردنانەدا کە لە بابەتی « وەک‌یەک »ەوە کران و دروست ئەبن ئەبێ ئـەوەش بزانین کە ئیشـی وەک یەک زیاتر بۆ بەخشـانە لە راستیدا نەوەک بـۆ هۆنـراو ، چونکە وەک یەک بۆ « ایضاح »و ئاشکراییە ، » ئـەم ئاشکرایی و ئیزاحـە فرمانی بەخشانە ، ئەوەندە هەیە تۆکە لە هۆنزاودا « ایضاح » پێـک دێنی بۆ ئەوەیـە کە لـە بەخشـانی نزیـک بخەیتەوە ۰



# دروست و خوازه

زۆرتر لە زانایاتی زانیاریی بەلاغە بابەتی دروست و خوازەیان پاش قسەکردن لە « مجــازە »وە کردووە • وە مەبەستیش لەم بابــەتــە «خوازە»کەیە ، چونکە ئەو وشەیە کە راستە « حەقیقەتە » هیچ قسەیەکی تێدا نی‌یە • کە ئەوتــرێ زانیاریی بەلاغە ، زیاتر هەر بۆ « مجــاز »و خزمەکانی مەجازە •

جا من لە رەوانبێژیی ئەدەبی کوردیدا ئــەوەم بە لاوە رەواتر و رەواتر بوو کە ئەم باسی دروست و خوازەیە پێش مەجاز و خزمەکانی مەجاز بکەوێ •

ئەمــەو دیسان وەکوو وترا زیاتر لــە زانیاری‌یەکانی رەوانبێژیی لەم دروســت و خوازەیەوە پەیدا ئەبێ • ئەمەش مەرج نی‌یە کە هەر وشەیەک بە پێی دانانەکەی دروست ـ حەقیقی ـ نەبوو ئیتر ئــەبێ بە خوازە و دەست و پێوەندی خوازە ، بەڵام زۆرتر لە زمانــا هەر وا بووە کە ئەگەر وشەکە دروست نەبێ ؟ واتە حەقیقی نەبێ لە گوزارەکەیا بووە بە خوازە و بنەماڵــەی خوازە • کەوا بوو کاریگەریی دروســت و خوازە بــۆ زانیاریی خۆشخوانیی دەستێــکی باڵای هەیە • ئیتر بــەو بۆنەوە ئەڵێین :

وشە لە هــــەر زمانێکا بێ سەرەتا ، کە داهاتووە ، وە یــا یەکەم کەسی ئەو زمانــە ئەو وشەیە بە سەر زارا هاتووە و بۆ شتێــکی تایبەتی دایناوە ـ کە بــەمە ئەوترێ « دانانی زمانی » ـ لەپاشــا بەرە بــەرە پێویســتی ئەو زمانە ، وە یا خاوەن زمانەکە زیاد بووە ، وشەکان بەشــی

ئەو پێویسـتـت و گوزارانەیان نەکردووە ، بە ناچاری هێـنـاویانە ئەو وشانە کە سەرەتا بـۆ شتێـکی تایبەتی دانراون لە گوزارەیترا و بـۆ شتیتریان بەکار هێناوە .

تەنانەت جاری واش هەبووە کە ئاشنایەتی وشەکە لـەگەڵ گوزارە بـۆ دانراوە بناغەییەکەشیا بـرراوە ـ کە ئەمەیان لــە کردەوەی زەمان و چەرخ بووە ـ ؛ واتە گەلێ جاری وا بووە ئەو گوزارەیە کە لە ســەردەمی خــۆیا بۆ وشەیەکی تایبەتی بووە ، ئەو گوزارەیە لــە ناو چووە و وشـەکە کراوە بە قاڵب بۆ گوزارەیەکیتر ، بەڵام ئەمەیـان وەنەبێ زۆر بـووبێ . بەڵکوو زۆریی هەر لەوەدا بووە کـە وشـەکە بێجگە لە گوزارە رەسەنیەکەی خۆی گوێزراوەتەوە بۆ گوزارەیەکیتر و ئاشنایەتیشی لەگەڵ گوزارە بناغەیەکەی خۆیا هەر نەبچرراوە .

جا بـە هۆی ئەم ئاوتوەوە خــوازە و خواستن و درکــە و شتیتر پەیدا بووە ، وشە دارڕێژراوە بناغەیەکە پێی وتراوە «دروست ـ حەقیقـەت» ، بەوانیتـر وتراون . خوازە ، درکە ، خواستن . بــە وێنــە :

« سەر ، دەسـت ، راست ، ئازاد ، بـەراو ، رووت » یـانەی تاریک ، نەوباوە ، رووپۆش ... هتد » .

کە لە بناغەدا بە دانانی زمانی « سەر » بۆ ئەو سـەری مـرۆڤ و گیانلەبەرەیە » « دەست » بۆ ئەو دەستەیە کە دیارە و بە مرۆڤـەوەیە » « راست » پێچەوانەی لارە » ئازاد » بۆ رێک و پێـک و راسـتە ٠ » بەراو » بۆ بـەردەمی ئاوە » « رووت » بـۆ ئەوەیە کەهیچی لــە بەرا نەبێ » « یانـەی تاریک » دانراوە بۆ ماڵی تاریک » « نەوبـاوە » مێوەی تازە پێی گەیشتووە » « رووپۆش » بۆ ئەو کەسەیە کە رووی خۆی دائەپۆشێ ٠

کەچی ئەمانە هەموو گوێزراونەتەوە بۆ جێگایانی تر : « سەر » بۆ سەردار ، وەکوو ئەڵێ : ئەو خێزانە » وە یا ئەو لەشکرە بێسەردار مواەتەوە » • وە یـا وەکوو « شوکری فەزلی » ئەڵێ :

« قەومی بێ سەر نی‌یە ئیمرۆ لە هەموو عالەمدا »
« دەتەوێ تاجی سەری بی بە هەوا گێژی نەکەی »

« دەست » ئەڵێ : دەسـت درێژە » واتە بە دەسەلاتە • وە یـا وەکوو « پیرەمێرد » ئەڵێ :

« ئـەو کـەسـەی کەوا دەستی درێـژە »
« لەگەڵ ئەو دەستەی ســەریشی گێژە »

« راست » واتـەبێچو پەنای تێدا نی‌یە • وە یا وەکوو شێـخ‌رەزا ئەڵێ :

« لە هەرلایە کە راستت دی سەلامی لێ بـکە قوربـان »
« گوریسی نـاو هەمانـە پێم ئەڵێ راستی‌ی منم قوربان !»

« ئازاد » بووە بە نـاو بۆ مرۆڤی تایبەتی و بۆ سەر بەسـتی • وەکوو « چوررستانی » ئەڵێ :

« کە بۆ لاوانی ئازادی » بە ئازادی ژیان مەرگـەوت »
« ئەڵێن ئەو رۆژە نەورۆزە ، گوڵی دڵخوازی خۆیانە »

« بەراو » ناوە بـۆ ئەو زەویە کە ئاوێـک ئاوی ئـەدا » وەکوو « دڵدار » ئەڵێ :

« بەراوی ماڵی ئاغایـە بـەراتم »
« سالاوی ماڵی کوێخایە خـەلاتم »

« رووت » بۆ هەژار و نەدارا • وەکوو « نالی » ئەڵێ :

« هەرچەندە کە رووتم بە خودا مائلـی رووتم »
« بێ بەرگیە عیللەت کـە هەتیو مەیلی هەتاوە »

وە یـا « سافی » ئەڵێ :

**« ئەگەر رووتم ، ئەگەر قووتم ، ئەگەر دێوانەو پووتم**

**« نی‌یە چارەم ، نی‌یە چارەت ئەمن هەر مائلی رووتم »**

« یـانەی تاریک » بۆ گۆرر ، وەکوو « حەماغای دەربەن فەقرە » ئەڵێ :

**« دیم دەنگێ ئاما نەتۆی خاکـــەوە »**

**« ئەو یانەی تاریک حەسرەتناکەوە »**

« ئەوباوە » بـۆ یەکەم کۆرپەی ئـافرەت ؟ واتە ئۆسکە کە ئـەمە زۆر خۆشـــەویست و بەنموودە لـــە لای باوک و دایک « لــەم رووەوە وەکوو « حەمدی » ئەڵێ :

**« ئەوباوەیە ئەو شاسوارە وا لە مەیـدانی جـــەنگا »**

**« شێری نەرر ، پڵنگی نەبەز ، تازا و چابوک ، سەف دررە »**

« رووپۆش » بەکار ئەهێنرێ بـۆ پەچەی ژنان « وەکوو « نوری شێخ سالح » ئەڵێ :

**« ئەیوت ئەو رووپۆشە تەنها رووی ئەپۆشیوین و بەس »**

**« روو بە رووی خۆتان حقووقی نایئە ناو لسیانـــــەوە »**

سـەیر ئەکەین ئەمانە هەموو لە گوزارە بناغەیەکەی خـــۆیان گوێزراونەتەوە و بـۆ شـتی‌تر بەکار هێنراون ؟ واتە لە دروستەوە چوون بۆ خوازە «



# خـــــوازه

## درکه

### خوازه :

خوازه وه یا خـوازمان له دەستووری زمانی کوردی دا نـاون بۆ ئەو واتایـــە که له زمانی عەرەبی‌دا بـــە « مەجاز » گوزارشتی لێ‌ی دراوه‌تەوه ٠

هەروەها درکه ، وه یا « گۆشه »ش دیسان له زمانی کوردی‌دا لـە باری رەوانبێژی‌یەوه بەکار ئەهێنرێ بۆ ئەو چەمکه که له زمـــانی عەرەبی‌دا به « کنایه » ناوی دەر کردووه ٠

وشه ناتوانێ به تـــەواوی له دایەخی گوزاره دەر بێت ؛ واتـه گوزاره فرەیه و وشه کەمه ٠ لەبەر ئەمه ، وه لەبەر ئەوه که وشه له کاتی دانانیا بۆ یەک شتی تایبەتی دانراوه ، پاشان پێویست زۆر بووه ، وشه نەبووه که بۆ ئەو پێویسته دابنرێ، به ناچاری هێنراوه ئەو وشەیه که لەکاتی خـۆیا بۆ شتێـکی تایبەتی دانـراوه گوێزراوه‌تەوه بۆ ئـەو شته پێویستـه که داهاتووه ٠ لەم گواستنەوەیه خوازه و درکه پەیـدا بـووه ٠

کەوابوو خـــوازه و درکه خزمایەتیەکەیان لەم شوێنەوه دەستی پی‌کرد ؛ واتـه له شـوێنی کەمی‌ی وشەو زۆری‌ی گوزارەوه ئـاتـاج بوون به وشه پەیدا بووه ٠

ئەمجا جیایی له نێوانیشیانا ئەوەیه که :

ئەو وشەیه لەکاتی خۆیا بۆ گوزارەیەکی تایبەتی دانراوه ، ئـەو گوزارەیه بووه به گوزارەیەکی راسته و راستی وشەکه ، تیـبـیـنه که

هێنراوە و گوێزراوەتەوە بۆ گوزارەیەکی‌تر ، ئەو رستەیە کە ئەو وشەیە تێدایە ، وا پیشان ئەدا کە گوزارە بۆ گوێزراوەکە ، لازم ـ پێویست ەی وشەکەیە ، وە دانەر ، وە یا تۆیش مەبەستان گوزارەی دووەمە ؛ واتە گوزارە بۆ گوێزراوەکە ، لەگەڵ ئەوەشا وشەکە ئەگونجێ بۆ گوزارەی یەکەمیش ؛ واتە گوزارە بناغەییەکە ، ئەم گونجانەش ، بەو جۆرە کە نیشانەیەکی تایبەتی لە ئارادا نەبێ بۆ ئەوە کە وشەکە راستەو راست روو بە رووی گوزارە ئەسڵیەکە بکاتەوە .

بەمە خوازە و درکە لێک جیا ئەبنەوە ؛ جیا بوونەوەکەش بەو جۆرەیە ئەگەر لە رستەکەدا نیشانە هەبوو بۆ ئەوە گوزارە رەسەنیەکە مەبەست نەبێ ، واتە هەروا وشەکە بە رووتی لەنێوانی گوزارە رەسەنی و بۆ گوێزراوەکەدا مایەوە ، ئەوە ئەو وشەیە ئەبێ بە خوازە . ئەگەر ئەو نیشانەیە نەبوو ؛ واتە شتێک لە ئارادا نەبوو کە وشەکە ببرێ بە سەر گوزارە رەسەنیەکەدا و بیچەسپێنێ پەوەوە ، ئەوە ئەبێ بە درکە .

* * *

پاش ئەوە کە خوازە و درکە لێک جیا بوونەوە ئەبێ ئەمەش بزانرێ کە خوازە لە سەر دوو ، وە درکە لە سەر سێ جۆرە .

دوو جۆری خوازە یەکێکیان « زیري ـ عەقلی »یە ، یەکێکیان « زماني ـ لوغەوی »یە .

زیری‌یەکە ئەوەیە کە کردەوەیەک بدرێتە لای شتێک ، وە یا یەکێک کە لە راستی‌دا رەوا نەبێ بدرێتە لای ئەو . وەکوو ئەوە کە ئەڵێی « زانکۆیکم دانا » . ئەو کەسە کە ئەوە ئەڵێ ئەمە

شتێکی راستە کە ئەو بووە بە هۆی دروستکردن و جێبەجێ بوونی زانکۆکە ، بەڵام لە روویەکی راستیەوە رێکخستن و پێکهێنانەکەی مامۆستا و کرێکارەکان بوون و ئەوان ئیشەکەیان بە تەواوی هێناوەتە ئەنجام .

جا ئەم جۆرە خوازەیە پێی ئەوترێ خوازەی ژیری چونکە ژیرییەکە ئەم جۆرە ئیشکیلە ئەدا .

لەگەڵ ئەمەشا ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەم خوازەی ژیرییە لە راستیدا ئەبێ بە چوار بەشەوە ؛ لە کاتێکا کە وترا کردەوەکە بدرێتە لای شتێک ، وە یا یەکێک کە لە راستیدا رەوا نەبێ بدرێتە لای ئەو ، ئەمە ئەم بەشکردنەمان بۆ دروست ئەکا ؛ چونکە کردەوەکە کە ئەدرێتە لای شتەکە یا دروست «حەقیقی»یە . کە ئەڵێن دروستە ، واتە ئەو نیسبەتە ، کە ئەدرێ « زمان » هەردوو سەرەکەی بە حەقیقی دا ئەنێ ، وەکوو ئەوە ئەڵێ « بەهار نێرگسی رواند » .

لێرەدا « بەهار » هەیە ، «نێرگس» هەیە ، « رواند » هەیە . بەهار رواندی . چی رواند ؟ . نێرگس . کەوا بوو لێرەدا « رواندن موسنەد» بەهار موسنەد الیە» ئەمانە هەر دووکیان حەقیقەتی زمانین چونکە چ رواندنەکەیە ، چ بەهارەکەیە لە شوێنی خۆیانا بە پێی دانانی‌زمان بەکار هێنراون . ئەوەندە هەیە خوازەکە لەوەدایە کە نیسبەتی رواندن دراوەتە لای بەهار ، کەچی ئەبوایە بدرایەتە لای خوا .

وە یا ئەو کردەوەیە کە ئەدرێتە لای شتەکە ، زمان هەر دوو سەرەکەی ـ موسنەد و موسنەد الیە کە ـ هەر بە خوازە دائەنێ، واتە «وضعی‌لغوی» . وەکوو ئەوە ئەڵێ : « بووکی چوار وختە ئەرزی ژیاندەوە » .

لێرەدا « ژیاندنەوە » هەیە ، « بووکی چوار وەختە » هـــەیە ، هەر دوو لایـان لە غەیری شوێنی راستەقینە و حەقیقـەتی خۆیانا بەکار هاتـوون ، هەر دووکیان بوون بە خوازە . « ژیاندنەوە » خوازەیە لـە «رواندن» . « بووکی چـوار وەختە » خوازەیە لە « بەهار » ؟ واتـــە بەهار ئەرزی رواندەوە ، بەلام ئەسڵی ئیسنادەکە خوازەیەکی ژیریەیە . لەگەڵ ئەمەشا دیسـان ئەم رسـتەیە هەر پرریەتی لە خوازە ، وەلـێ بەهۆی لابـردنی وشـەو دانی سفەتی ئەو وشەیە بە وشەیەك ، کـە ماوە ؛ چونکە ئەسڵەکە ئەبێ وای لێ بێتەوە « بارانی بەهار گیای ئەرزی رواندۆتەوە » .

وە یـا موسـنەدەکە حەقیقەت بێ و موسنەد الیە کە مەجـــاز . وەکوو ئەڵێ : « بـووکی چوار وەختە نێرگسی رواند » ، « روانـــد » موسنەدە و حەقیقەتە ، « بووکی چوار وەختە » موسنەد الیە و مەجازە ؛ واتـــە حەقیقەتێـکی لوغەوییە ، چونکە « رواندن » کاتێ کـە دانەری زمان دایناوە هـــەر بۆ ئەو مەعنایە داناوە کە هەیە و بە مەعنا « شین بوونە » . « بووکی چوار وەختە » موسنەد الیە و خوازەیە لە « بەهـار » ، چونکە دانـەری زمـان ئەو وشەیە بۆ « بەهار » دانـەناوە ، بەڵـکوو بۆ « وەوی » یـەکی داناوە کە لە هەموو دەمێـکا هەر بووك بـێ ؛ یـا لە بەهار و هاوین و پایزو زستانا ، یا لە بەیانی و نیوەڕۆ وئێـوارە و شەوانا ، ئەگونجێ بۆ هەمووی .

وە یا بە پێچەوانەوە ، ئەڵێ « بەهـــار ئەرزی ژیانـدەوە » . «ژیاندنەوە» موسـنەدە و مەجازە ، « بەهار » موسنەد الیە و حەقیقەتە . ژیاندنـەوە نیسبەت دراوەتە لای بەهار ، بەهار حەقیقەتە بـۆ ئەو کرەی کە کەوتۆتە نێوانی زستان و هاوینەوە . دانەری زمان وای دانـــاوە . « ژیاندنـەوە » « واضـحی » زمان دایناوە بۆ زینـدوو بوونـەوەی

گیانلەبەر ، ئیستــە لە غەیری شوێنی خۆیدا بەکار هاتـــووە ، نیسبەتی ئەم زینـــدووبوونەوەیە بۆ لای بەهـــار ونەبێ حەقیقەت بێ . بەهـار لە راستـیدا خوا نییە کە شت زیندوو بکاتەوە، بەڵکوو ئـەو بارانـە کە لــەو کاتەدا ئەبێ ، ئەبێ بە هۆی ئــەوە کـە رووەکـی زەوی ئەبووژێنێتەوە .



زمانییەکەش ـ کـە لوغەوییەکەیە ـ مەبەست بــەم گوزارشتە ئەوەیە وشــە لەکاتی خۆیا کە دانراوە بۆ شتێکی تایبەتی دانــراوە ، پاشان گوێزراوەتەوە بۆ گوزارەیەکیتر ، وە ئەبێ پەیوەندی لە نێـوانی هەر دوو گوزارەکــەدا هەبێ ، ئەم پەیوەندیەش پەیوەندێــک بــێ هەســت بۆی بچێت و بیدۆزێتەوە ، نــەوەک پەیوەندی راستەقینـە کە جیانەبوونەوەیە .

بە وێنە باسـی خۆشی و سازگاری شوێنێـک ئەکا ئەڵێ : «چـوومە ناو بەهەشتێـکەوە » دیارە گوزارەی راستەقینەی بەهەشت ئەو شوێنـە تایبــــەتییەیە کە خوا بەڵێنی داوە پێدا بە چاکان و پارێزکاران .

لە وێنەکەی ئێمــەدا پەیوەندیەکی هەست پێی کراو هـەیە لە نێوانـی گوزارە رەســەنیەکە و گوزارە بــۆ گوێزراوەکەدا ـ کـە خۆشیی هـەر دوو لایە ـ نیشانەش هەیە کە نایەڵێ گوزارە رەسەنیەکە بگرێتەوە ، ئـەو نیشانەیەش باسکردنی شوێنە تایبەتییە خۆشەکـە و نەبـوونی بەهەشـــتی راستەقینەیە لەبەر دەستدا .

دیسان ئەوەش هـەر ئەبێ بزانرێ کە زیاتر « خـــوازە » بە سەر « خـوازەی بەرەڵا ـ مجازی مرسل »دا سەرەو نخوون ئەکرێتەوە، ئەم خوازەی بەرەڵایەش جیــاکردنەوەی لەگەڵ خواستن دا ئــەوەیە کە ئەگەر پەیوەندی لە نێوانی دوو شتەکەدا ؛ واتە لێی خواســتراو و

بۆخواستراو لێکچوون بوو ، ئەوە خواستنە ۰ وێنە وەکوو «تاهربەگ» ئەڵێ :

**« لە رووی ئەو ماهەدا وەستام بە ئومێـــــدی حەیاتی تر »**

**« کەچی دەردی «پوان» لێی دام، ئەما بۆم ئەو حەیاتەش بووم»**

لێرەدا « مشبەبە » هەیـە کە « کـەتان »، و نەوتراوە ۰ « مشبە » هەیە ـ کە خۆیەتی و بـــە « وەستام » گوزارشتی لێی داوەتەوە ـ ۰ لە ملائماتی « مشبەبە » کە هەیە ـ کە « رزان »، « کەتان کە ، لەبەر مانگ دا رابگیرێ ئەرزێ ۰

ئەگەر لێـکچوون نەبوو ئەوە خوازەیە ، خوازەی بەرەڵاش ئەوەیە کە نەبەسترابێ بە هیچ پەیوەندیەکەوە ۰

لـە وێنەیەکی وەکوو « کابرا دەستێـکی درێژی هەیە » ، لێـرەدا دەست بۆ دەسەڵات بەکار ئەهێنرێ ۰ لە نێوانی دەســتو دەسەڵات دا وەنەبێ پەیوەندی‌یەکە لێـکچوواندنی دەست بێ بە دەســـەڵات ، بەڵکوو دەستەکە « بایسێـکی هۆی ـ عیللەتێـکی سەبەبی »یە بۆ دەســەڵات و زەبەر بە دەستي ، چونکە بە هوی‌دەستەوەیە کە هـەموو جۆرە فرمان و بەڵکوو فەرمانێـک دێتە ئەنجام ۰

ئەگەر خـۆ مەبەستیش ئەوە بێ کە « دەست » وەر بگیرێ بـۆ دەسەڵات و مەبەست بە دەسەڵات زەبەر بـە دەستي بێ ، ئەوە لێکچوون هەیە ـ کە هێزو توانایە لـە هەر دوو لایانا ـ لێـرەدا ئەبـێ بــــە خواستن ۰

لە ســــەر ئەم ناساندنە و بەم جۆرە ، هەر یەک وشـە ئەتوانرێ گەلێ جـــار بە خواستن و بە خوازەش دابنرێ ، دیارە ئەمە نیازەکـە ئەیانگۆررێ و اعتبارات دروستی ئەکا ۰

# درکە

وترا ئەگەر شتێک لە ئارادا نەبوو کە وشەکە ببرێ بە سەر گوزارە رەسەنی و نـەژادیەکەدا ئەوە درکەیە • وە درکەش لە سەر سێ جۆر بوو ؛ جۆرێـکیان مەبەست زاتی شتەکەیە ، جۆرێکیان مەبەست بەو سفەتی شتە ، جۆری سێیەم درکەیە لە هـاوگری ـ نیسبەت ••

ئەوەیان کە خودی شـتەکەیە وەکوو « موخلسی سـەقزی » ئەڵـێ :

**« لەنجەی کوتر و لەرەی مامزو بۆنی وەنەوشە و رەیحانە و شەو بۆ »**
**« ئاوازی بولبول ، نەرمی پەرری قوو ، شیرینی نەبات گشت هاتن بۆ تۆ »**

ئـەم هەموو شتانە درکەیە لەو کەسە تایبەتی‌یە کە هـۆنەر باسی کردووە و خۆی ئەیزانی!• چەند سفەتێکی هێناوە کە هەر یەکە لەوانە جیا جیا خاوەنێکی تایبەتیان هەیە ، بەڵام بە هەموویانەوە شتی‌تر و کەسی‌تر نی‌یە بیگرنەوە تەنیا مەوسووفەکەی هۆنەر نەبێ •

هەروەها « باڵایەکی راست و هۆشێـکی تەواوی هەیە» • ئەمەش درکەیە لـە ئادەمیزاد ، چونکە هیچ شتێـکی‌تر نی‌یە کە هـــەر دوو وەسفەکەی پێـکەوە تێـدا بێتە دی جگە لە ئادەمیزاد نەبێ •

جۆری دووەم کە مـەبەست سفەتی شـتەکەیە ، ئەمیش ئـەبێ بە دوو بەشەوە • چونکە سفەتەکە یا ئەمەیە گوێـگر زوو بـۆی ئەچێ و وەری ئەگرێ • یـــا درەنگ ، واتە پێویستی بە بـیر کردنەوەیەکی زیاد هەیە •

ئەوەی کە زوو بۆی بچێ وەکوو لە وەسفی یەکێکا ئەڵێ :
« کابرایەکی هەڵەشەیە » ، ئەمە درکەیە لە زۆر بلێتی کابراو بیرنەکردنەوەی لە قسەدا .

ئەوەشیان کە رێگا دوورەکە بێت و پێویست بە بیر کردنەوە و ورد کردنەوە بێت وەکوو ئەوە باسی ماڵێک ئەکرێ کە ئازۆخەیەکی زۆریان خستووە ، کەچی زوو دوایی هاتوە ، دەربارەیا ئەڵێن : « ماڵێکی بە ئەرکن » .

ئەمە درکەیە لەوە «کە» ماڵێکی میواندارن ، چونکە لە میانەی قسەدا ئەوە دەر ئەکەوێ کە ئەو ئازۆخەیە زوو دوایی هاتووە ، ئەم زوو دوایی هاتنە لەبەر ئەوە بووە کە زۆری لێ‌ی خواروە . زۆر لێ‌ی خواردنەکە لە بەر زۆر میوان هاتن بووە و میوانداری‌یان بۆ کردون .

جۆری سێ‌یەم درکەیە لە « هاوگری ـ نیسبەت » ؛ واتە کۆمەڵە سفەت و گوزارەیەک ئەدرێتە پاڵ یەکێک . بەڵام نەوەک راستە و راست ، بەڵکوو لە رێگایەکی بەنامەکی و دوورەوە ، بە جۆرێ کە ناوی کەسەکە ناهێنرێ، دێنی کۆمەڵە سفەتەکە ئەدەی بە شتێک کە شتەکە تایبەتی‌یە بەو کەسەوە کە ناوەکەی راستە و خۆ لە رستەکەدا نی‌یە . ئەم ئیشەش بۆ زیاتر بەرزبوونەوەی کەسەکەیە ، چونکە لەمەدا هەوشە و موبالەغە زۆرتر ئەبێ و نەفس زیاتر پێ خۆشە .

جیا بوونەوەی ئەم بەشەشیان لە دوو بەشەکەی‌تر ؛ واتە لە درکە لە خودی شتەکە و لە سفەتەکەی ئەوەیە کە لەماندا درکەیە لە تاکە تاکەی گوزارەکە . بەڵام لەودا درکەیە لە هەموو گوزارە

کۆمەڵی‌یەکە . وێنە بۆ ئەم جۆرەشیان وەکوو ئەڵێ :

**. پیاوەتی و نان‌بدەیی و ئازایەتی بوون بە مەشخەڵێک و وان بە سەر کۆشکەکەی سەرداری بۆکانەوە » .**

خاوەنی ئەم رستەیە مەبەستی ئەوەیە کە ئەم هەموو سفەتانە بدا بە یەکێک ، بەڵام لەبەر زیادە وەسفی‌تر ناوی کەسەکە ناهێنێ .

ئەمانە ئەکا بە مەشخەڵێک و دایائەنێ بە سەر کۆشکی ئەو کەسەوە . لەمەوە ئەوە دەرئەکەوێ : مادام ئەم شتانە بە سەر کۆشکی ئەو کەسەوە بوون ئەبێ هەموویان لە کەسەکەدا هەبن . ئەو کەسەش « عەزیزخانی گەورە » و هەر ئەو بووە کە بە سەرداری « بۆکان » ناوبانگی دەر کردووە .



# خواستن

ناساندنی خواستن ئەوەیە کە وشەیەک لە شتێکا بەکار هێنراوە کە ئەو شتە چوێنراوە بە گوزارە ڕەسەنی وشەکە لەبەر پەیوەندیەکی لێکچوون ـ مشابە .

جا لەبەر ئەمە ئاشنایەتی لە نێوانی « وەک‌یەک ـ تشبیه » و « خواستن ـ ئیستعارە »دا ئاشنایەتیەکی بەهێزە ، چونکە خواستن لە وەک یەکە بەهێزەکەوە دروست ئەبێ ؛ واتە ئەو وەک یەکە کە هەر « لەوچوون ـ مشبەبە »کە و « لێ‌ی‌چوون ـ مشبە »کەی تێدایە ، کە ئەمە « لێ‌ی‌خواسترا و ـ مستعار منە » و « بۆ خواستراو ـ مستعار لە » ئەگرێتەوە .

لێرەدا ئەگەر هات و «لێ‌ی‌چوون ـ مشبە»کە نەوترا ، وە یا لە دڵا نەبوو ، بەڵکوو هەر «لەوچوون ـ مشبەبە »کە وترا ، وە یا ئەگەر « لەوچوون » نەوترا « لێ‌ی‌چوون » ئەوترێ ، ئەوەندە هەیە پەیوەندیەکی لەوچوونەکەی ئەدرێتێ « ئەمە ئەبێ بە «خواستن» « وەکوو « ناڵی » ئەڵێ :

**« دەست بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن »**

**« یا حەلقەیانە سۆفی مل‌خوار و مەندەبوور »**

هات و چۆکردن و گەڕران ئیشی مرۆڤە ، هی دارو دەوەن نی‌یە ، هۆنەر هێناویە سەرو و نارەوەنی چواندووە بەو مرۆڤ و کوڕرانە کە سەما ئەکەن و دێن و دەچن « هات و چۆ کردن لە ئیشی لەو چوونەکەیە ، ئەو ئەم سفەتەی هێناوە داویە بە لێ‌ی‌چوونەکە ، بەم جۆرە کردوویە بە خواستن .

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە خواستن لەگەڵ « خوازە ـ مجاز » ئەبن بە خزم « چونکە خوازە کە دوو بەشـــی هەبێ ؛ خوازەی زماني ـ لوغەوی « خوازەی ژیري ـ عەقلی » زمانی‌یەکە دوو لقـــی لێ‌ئەبێتەوە ؛ یەکێ خواستن « یەکێ خوازەی بەرەڵا ـ مجازی مرسل ـ» کە وا بوو خواستن و خوازە لە خێزانی بنەماڵەیەک بوون ٠ جـــگە لەمەش ، خواستن لە راستی‌دا « خوازەیەکی زماني ـ مجازی لغوی ـیە « چونکە لە خواستن‌دا « لەو چوون ـ مشبەبە « ئەوتـــرێ و بـۆ ئـەم لەوچوونە دانراوە ، نەک بۆ لێ‌ی‌چوونەکە کە « مشبە »کەیە ٠

پێش ئـەوە کە بە درێژي باسی جیاوازي خوازە و خواســـتن بکەین لەبەر ئەوە کە دۆستایەتیەکەی وەک یەک و خواستن تونـــدو تیژە « باسی ئەو هەنگاوانە ئەکەین کە شا هەنگاون بۆ جیابوونـەوەی ئەو دووە :

١ ـ وەک یـەک دوو پایەی بناغەیی هەیە ؛ لەوچـــوون و لێ‌ی‌چوون ، خواستن هەر یەکێـکی هەیە ٠

٢ ـ لە وەک‌یەک‌دا ئەگونجێ لێـکچوونەکە بوترێ ، بەڵام لـە خواستن‌دا بەهیچ جۆر نابێ بوترێ ٠

٣ ـ لە وەک‌یـەک‌دا شتێـکی ئاشکرایە کە لـــەوچوونەکە ـ مشبەبە ـ زەقترە ، بەڵام لە خواستن‌دا ئەو زەقیە نامێنێ « بەڵـــکوو تێـکلاّوي پەیدا ئەبێ ، لەم تێـکلاّوی‌یە ئەم سەر و ئەوســـەری دوو شتەکە زیاتر لێـک نزیک ئەبنەوە ٠

٤ ـ وەک‌یـەک و خواستن هەردوولایان رووەو مەڵبەندێـک ئەڕۆن بۆ ئەوە هەر دووکیان تیایا هاوبەش بن « ئەوەندە هەیە لەجۆری ڕێگاکانیانا جیا ئەبنەوە ٠

له خواستن دا لێی خواستراو ـ مستعار منه ، واته مشبه‌به ، بۆ خواستـراو ـ مستعار له ، واته مشبه ، هه‌یه ، وه‌کوو له‌وچـــوون و لێی‌چوون ـ مشبه‌به و مشبه له وه‌ك یه‌ك‌دا هـــه‌یه . ئـه‌م لێی خواستراو و بۆخواستراوه‌ش هه‌ر یه‌کێکیان له رسته‌که‌دا ئه‌بن . ئه‌وه‌نده هه‌یه نـاو نه‌بردنه‌که‌ی وه‌نه‌بێ کۆسپ بێ بۆی و لـه پایه‌یه‌تی بخا ، هه‌روه‌ها ئه‌بێ نیشـــانه‌یه‌کی دیار له رسته‌که‌دا هه‌بێ بۆ ئه‌وه گوزاره راسته‌قینه‌ی وشه‌که مه‌به‌ست نه‌بێ .

دیـان به‌هیـچ جۆر نابێ ئه‌وزار و لێـکچوون له رســـته‌که‌دا هه‌بێت ، په‌یوه‌ندی له نێـوانی لێی خواستراو و بۆ خواستراودا هه‌یـه ، ئه‌وه له بیر ئه‌برێته‌وه که لێـکچواندنی مه‌عنه‌وی له نێـــــوانی لـێی خواستراو و بـۆ خواستراودا هه‌یه ، چونکه ئه‌ویستری ئه‌و دووه لـه یه‌ك بـوّته‌دا قاڵ بکرێنه‌وه ، نه‌ك بچوێنرێن بــه یه‌ك و وه‌ك‌یه‌ك په‌یدا بێ .

دوور نی‌یه بوترێ ئه‌م ناساندنه بۆ خواستن به‌م جۆره له‌وانه‌یـه وای لێ‌بکا له‌گه‌ڵ درۆدا جیـا نه‌کرێنه‌وه و یه‌ك بگرنه‌وه !

ئه‌ڵـێن ئه‌و رسته‌یه که خواستنی تێدایه ، وه یـــا بڵێین «خواستن» بـه دوو شت له درۆ جیـــا ئه‌بێته‌وه ، یه‌که‌م به « تأویل » و بـه‌رپه‌رچ دانه‌وه ، واتـه داوای ئـه‌وه ئه‌کرێ « مشبه » که ـ که بـۆ خواستراو ـمستعار لەـکه‌یه له ره‌گه‌زی «مشبه‌به»که‌یه،واته له جنسی لێی‌خواستراو ـ مستعار منه ـ که‌یه ، دیـاره درۆ ئـه‌م داخوازیه‌ی تێدا ناکرێ ، دووه‌م نیشانه‌یه‌ك هـه‌یه له ئیستعاره‌که‌دا که تۆ داوای زاهره‌که ناکه‌ی ، لـه درۆدا ئه‌م شته نی‌یه .

* * *

به‌شـــه‌کانی خـواســتن زۆرن ، بـه‌ڵام له هه‌موویـان به دیمه‌تر ئه‌مانه‌ن :

« مصرحة » مكنية » مجـردة » مرشحة » • به اعتبارێکی‌تر هـەر له نـاو ئەمانەدا سـێ بەش دانراوە : « مطلقة » مجردة » مرشحة » « بابەتی هەرە بـاوی ئەمانە « مصرحة » و « مكنية »یە • لـەمەو دوا بـە درێژی قسەیان لێوە ئەکەین •

« خواستنی مصرحة » ـ کە من بەلامەوە « خواستنی بـێ‌پەنا » وە یـا « ئاشکرا »یە ـ « لە هەمانکاتا ئەم « مصرحة »یە «تحقیقیة»شی پێ‌ی ئەوترێ، ئەوەیە: ئەوەی کە ئەوترێ « لەوچوون ـ مشبەبە » ، واتـە « لێ‌ی‌خواستراو ـ مستعار منه » کە بێ ، وە لە ملائماتی « لێ‌ی چوون ـ مشبه »،واتە « بـۆخواستراو ـ مستعار له »کە لە رستەکەدا هەبـێت « وێنەکە وەکوو « وفایی » ئەڵێ :

« چاوەکەم ئیمڕۆ لە گولشەن گول بە عیشوە خۆی نواند »
« نەک نەکگیر بم ، بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند »

لێرەدا « لێ‌ی‌خواستراو ـ لەوچوون » هەیە ـ کـە « گوڵ »ە ـ « لێ‌ی‌چوون ـ بـۆ خواستراو » هەیـە ـ کە « یـار »ە « نـاوی نەهێناوە ـ « لە ملائماتـی بۆ خواستراو ـ کە یارە ـ عیشوە و خـۆ نواندنە « ئەم ملائمـاتەی داوە بە لێ‌ی خواستراوەکە ـ کە گوڵەکەیـە لەگوڵشەن‌دا ـ بۆ ئـەوە بەو جۆرە خۆی بنوێنێ •

« ئیستعارەی مكنية » ـ کە من بەلامەوە « خواستنی بەپەنا » وە یـا « بە درکە »یە ـ لە هەمانکاتا ئەم « مكنية »یە « تخیلیة »شی پێ‌ی ئەڵێن « ئەوەیە : ئەوی کە ئەوترێ « لێ‌ی‌چوون ـ مشبه » ، واتە « بۆ خواستراو ـ مستعارلە »کە بـێ ، وە لە ملائماتی « لەوچوون ـ مشبە بە » واتـە « لێ‌ی‌خواستراو ـ مستعار منه »کە لە رستەکەدا هەبێت « وێنە وەکوو « نالی » ئەڵێ :

« گوڵ کە یاخی و دەم درراو بوو کەوتە لافی ڕەنگ و بۆی »
باغەبان گوێ گرت و دایهێنا بە دەستی بەستە بۆی »

یاخی‌بوون و دەم‌درراوی لە وەسفی مرۆڤە ـ کە ئەم مرۆڤە « لێی‌خواستراو ـ مستعار منه »کەیە ـ هۆنەر لێی‌خواستراوەکەی نەهێناوە ، بەڵکوو وەسفەکەی هێناوە و داویە بە بۆ خواستراو ـ « مستعارله »کە ـ کە « گوڵ »ە ـ ، واتە خواستوویە بۆ ئەو . هەروەها « گوێ » و « دەستی بەستە »ش .

دیسان « سجادی » ئەڵێ :

« شنەی ئەگریجەی نازدارانی کورد »
« لەشکری گوڵی بە تاڵانی برد »

لەشکر وشەیەکە تەنیا بۆ ئادەمیزاد دانراوە ، هۆنەر هێناویە داویە بە « گوڵ » ، لەولاشەوە تاڵانکردن « کردەوەیە » لە کاتی دانانی زمانا هەر بۆ ئادەمیزاد دانراوە ، ئەو هێناویە داویە بە « شنەی ئەگریجە » کە ئەم شنەیە لە نازدارانا هەیە و نازدارانیش ئادەمیزادن . واتە ئادمیزاد تاڵان ئەکا « لە هەر دوو بارا وەسفی لێی‌خواستراو ـ مستعارمنه دراوە بە بۆ خواستراو ـ مستعار له »

ئینجا « ئیستعارەی مجردة » وە یا تجریدیة « کە بە لای منەوە « خواستنی رووت » بۆ ئەم بەشە ئەشێت «

ئەمەش ئەوەیە : کە خواستنەکە بەرانبەری بکا بە شتێک کە ئەو شتە لە ملائماتی مستعارلە کەیە ، واتە بۆ خواستراوەکەیە . وەکوو ئەڵێ : « دەستی بڵاوە » واتە بەخشندەیە و شت زۆر ئەدا بە خەڵک « بڵاوی » خواستووە بۆ بەخشندەیی ، پاشان بڵاوی‌یکە بوو بە سفەتی « دەست »کە ـ کە ئەم دەستە موناسبە لەگەڵ بەخشندەیی‌دا . وە یا وەکوو « مخلص » ئەڵێ :

**« بارانی خوانی ئـەرژێتـە ناو دەشت »**

**« پێکەنینی خۆی دەشتی کرد بە وەشت »**

مەبەست ئەوەیـە کە بەخشندەیە « « خوان »ی خواستووە بـۆ بەخشندەیی ، پاشا وەسـفی کردووە بە « باران » « کە ئـەم بارانـە ئاشنایەتی هەیە لەگەڵ بەخشندەییدا ،

« ئیستعارەی مرشحە ، کە بە لای منەوە « خواستنی پاڵاوەتە » بۆی بەکارە .

ئەمیش کە : خواستنەکە بەرانبەرییی بکا بە شتێک کە ئەو شتە لە ملائماتی « لێیخواستراو ـ مستعار منە ، کە بێ » وەکوو ئەڵێ :

**« دینی فرۆشت بە دینا ، بەڵام بازرگانیەکی رەنجەڕۆ بوو »**

فرۆشتنی خواستووە بۆ گۆڕرینەوە ، ئینجا لە فرۆشتنەکە شتێـکی هێنـاوە کە لەگەڵ فرۆشـتنا پێکەوە بیانکرێ ، شتەکەش سـوود و تجارەتەکەیە .

بە کورتی لەم چوار بەشەدا ئەوەی کە زیادە بووە لە ملائماتـی « مصرحە و مکنیة » ، ئەگەر زیادەکە لە ملائماتی « لێیچـوون ـ مشبە »کە بوو ئـەوە ئەبێ بە خواستنی رووت ـ ئیستعارەی تجریدیة ـ . ئەگەر زیادەکە لە ملائماتی « لەوچوون ـ مشبەبە »کە بـوو ئەبێ بـە خواستنی پاڵاوتە ـ ئیستعارەی ترشیحیة ـ . ئەگەر بەرانبەرییی نەکرد لەگەڵ هیچ یەک لە ملائماتی لێیخواستراو و بـۆ خواستراودا ئەبـێ بە خواستنی ئازاد ـ ئیستعارەی مطلقة ـ .

وا ئەبێ خواستنی رووت و پـاڵاوتـە پێـکەوە کۆ ئەبنەوە . وەکوو « غەرقی » ئەڵـێ :

**« غەرقی سلاحە ئەو بەچکە شێری ئێمەیە گەر سەیری کەی »**

« مووی سەر ملو کەللەی وەها رژاوە تەواو وەسفی شۆردە بێ
نەکا »

ئەم هۆنراوە گەلێ شتی لە رووی خواستنـــەوە تێدا هەیە ، بەڵام ئەوەی مەبەستی تێمەیە « غەرقی ســــلاحە » ـ کە هــی رووت ، تجریدیەکەیە ـ ، چونکە لە ملائماتی بۆ خواستراوەکەیە ، ئەو بـــۆ خواستراوەش «بەچکە شێرە»کەیە « «مووی سەر و مل و کەللەی» هی پاڵاوتەکەیە ، چونکە لە ملائماتی لـێی‌خواســـتراوەکەیە ، ئەو لێی خواستراوەش شێری راستەقینەیە .

ئەبێ ئەوەش بزانرێ کە خواستنی پاڵاوتە پاراوتر و بتەوترە لــە هی ئازاد و رووت ـ لە مطلقة ومجردة ـ ، وە یـــا لە رووت و پاڵاوتە ـ تجرید و ترشیح ـ ، چونکە ئەم پاڵاوتەیە بە تـەواوی هووشە کاري و موبالەغەکە دروست ئەکا .

* * *

پاکژیەک لە بارەی خواستنەوە :

خواستن ئەبێ بە گەلێ بەشەوە :

بە اعتباری هەر دوو سەرەکەی ـ لێی خواستراو و بۆ خواستراوـ ئەبێ بە دوو بەشەوە .

بە چاو ئەو شتەوە کە لێی خواستراو و بـــۆ خواستراوەکە تیایـا هاوبەشن ـ کە ئەو شتە بەلای ئەهلی وەک‌یەکەوە بە « وجە الشبە » ناو ئەبرێ ـ ئەبێ بە دوو بەشەوە .

بەچاو لێی‌خواستراو و بۆ خواستراو و کۆکەرەوەکەیان ؟ واتــە، بە اعتباری ئەم سێیە ئەبێ بە شەش بەشەوە .

بە اعتباری وشەی « مستعار »،کە ئەبێ بە دوو بەشەوە ، واتـــە ئەسلی و تەبەعی .

دیسان خواستن به اعتبارێکی‌تر ؟ جگە لە اعتباری ئەم سەرو ئەوسەر و کۆکەرەوە و وشەکە، ئەبێ بە سێ بەشەوە ؟ • ئازاد • رووت ، پاڵاوتە ــ مطلقة ، مجردة ، مرشحة • •

ئەوەی کە بە اعتباری دوو سەرەکەی ئەبێ بە دوو بەشەوە ، ئەوەیە کە دوو لایەکە ، یا ئەگونجێ لە شتێکا کۆ ببنەوە • وەکوو ئەوە کە سەردارێک ئەڵێ :

« گومڕاکانمان هێنایەوە سەر ڕێگای ڕاست » واتە لە ڕێگا لایاندا بوو ، ڕێ بە دینمان بۆ کردن بۆ ئەوە بێنەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە • ئەوەش کە ناگونجێ کۆ ببنەوە ، وەکوو شتێکی نەبوو وە یا نەبوونێک بخوازی بۆ بوونێک ؟ واتە ئیستعارەی • معدوم • بکەی بۆ « موجود » • دیارە هیچ کەڵکێک لەم ئیستعارەدا نی‌یە و نابێ •

ئەوەی کە بەچاو • جامع ــ کۆکەرەوە • کە ؟ واتە ئەو شتەی کە هەر دوو لای خواستنەکە تیایا هاوبەشن •ئەمەش یا کۆ کەرەوەکە لە چەمکی لێ‌ی‌خواستراو و بۆ خواستراودا هەیە و داخڵە ، یا نی‌یە •

ئەوەی کە هەیە وەکوو ئەو وێنەیە کە ئەڵێ : « هەر دەنگێک ئەبیستێ بۆی باڵ ئەگرێتەوە ! • » • باڵ گرتنەوەی خواستووە بۆ هەڕا کردن • « کۆکەرەوە ــ جامع » لە نێوانی باڵ گرتنەوە و هەڕا کردنا •غاردانە • • ئەم غاردانە لە مەفهوومی باڵ گرتنەوە و هەڕا کردنا هەیە •

ئەوەی کە نی‌یە و داخڵ نی‌یە ، وەکوو خواستنی • پڵنگ • بۆ پیاوی ئازا و پاڵەوان • چونکە پاڵەوانی شتێکی عەرەزی‌یە بۆ پڵنگ ، پڵنگ خۆی درندەیەکە ، پاڵەوانی لە خارجی ئەوایە •

ئەوەش کە بە چاو لێخواستراو بۆ خواستراو و کۆ کەرەوەکەیە ، ئەبێ بە شەش بەشەوە ، روونکردنەوەکەی بەم جۆرەیە .

دووسەرەکە ئەگەر « حسّی » بوون ؟ واتە قەبارەیەکیان هەبوو ، کۆ کەرەوەکە یا حسّییە وەکوو ئەڵێ : « **کەڵەشێرە زێرینی سەر خەزنەکە ئەیخوێند** » . لێی‌خواستراو ـ مستعار منە ـ کە مشبەبە کەیە ـ کەڵەشێرێکی راستەقینەیە ، بۆ خواستراو ـ مستعار لە ـ کە مشبەکەیە ـ کەڵەشێرە زێرینەکەیە ، کۆ کەرەوەی هەردووکیان شکڵەکەیە ، ئەمانە حسّی‌ـن .

یا ئەو کۆکەرەوەیە « ژیری »یە وەکوو کابرا وتی : « **کێچ نەیهێشت بخەوم هەتا رۆژم لە شەو سەندەوە !** » . مەبەستی ئەوەیە ئەو شەوە هەر لە سەرێوارەوە کێچ نەیهێشتووە بنوێ هەتا کەوتە رۆژ . لێرەدا لێی خواستراو ـ مستعار منە ، شەوەکەیە ، بۆ خواستراو مستعار لە ـ کە ، دەرکەوتنی رۆژەکەیە ، ئەم دووە هەر دووکیان حسّی‌ـن ، کۆکەرەوەکەیان ؟ واتە جامع لە نێوانی ئەم دوو حسّی‌یەدا ، حەسانەوەیە ، چونکە کە رۆژ بووەوە کێچ وازی لێی‌هێنا و حەسایەوە .

ئەگەر خۆ دوو لایەکە و کۆکەرەوەکە هەموو « ژیری » بوون وەکوو ئەڵێ :

« **من چورتم دا بوو لە ژێر خاکا ، کێ منی هێنا بۆ ئێرە ؟** » لێی‌خواستراو نوستنە ، بۆ خواستراو مردنە ، کۆکەرەوەکە بێ ئاگایی‌یە لە هەردووکیانا نوستن و مردن لە بێ‌ئاگایی‌دا وەکوو یەک وانە .

یا ئەگەر دوو لایەکە یەکێکیان حسّی و ئەویکەیان « عەقلی » بوو ، «حسّی»یەکە لێی خواستراو ـ مستعارمنە ـ کە بوو ، وەکوو

ئەڵێ : « **شەکرێك بشکێنە** » • لێی خواستراوەکە شکاندنی شەکرە ، ئەوە حسّی‌یە، بۆ خواستراو ـ مستعار لە ـ کە قسەکردنە ، کۆکەرەوە لە بەینی ئەو دوو شتەدا گەشەیەکی رۆحی‌یە بۆ گوێگران • ئەم دووەیان عەقڵی‌ـن •

وە یـــا بە پێچەوانەوە بوو ؟ واتە دوو سەرەکە حسّیەکەیان بۆ خواستراو ـ مستعار لە ـ کە بوو • لێی خواستراو ـ مستعار منە ـ کە لەگـەڵ کۆ کەرەوەکەدا • جامع • عەقڵی بوون • وەکوو ئەڵێ : **ئاو بە ئاوەدانی‌دا ئەڕوا**» • ئاو • بۆ خواستراوەکەیە «حسّی‌یە» «ئاوەدانی» لێی خواستراوەکەیە • کۆکەرەوەکە • تێری »یە • ئەم دووە هـــەر دووکیان عەقڵی‌ـن لە فهووم‌دا ، چونکە مەبەست بە ئاوەدانی غـەیری برسێتی‌یە •

وە یا کۆکەرەوەکە هەندێکی • حسّی • و هەندێکی «عەقڵی» بوو• وەکوو ئەڵێ : « **مانگێـــك دەرکـەوت** » • مەبەستت ئینســـــان بێ لـە جوانیەکەیاو لە دڵگیریەکەیاە دوو سەرەکە ـ کە ئینسان و مانگەکەیە ـ حسـّـی‌ـن ، کۆکەرەوەکە هەندێکی جوانی‌یە ـ کە حسّـــی‌یە ـ بە هەندێکی دڵگیری‌یە ـ ، کە عەقڵی‌یە ـ •

ئـەو « ئیستعارە »یەش کە وترا بە چاو وشەکە « مستعار »ە کە ئەبێ بە دوو بەشەوە • ئەمەش ئەوەیە : کە ئەگەر وشەکە ئیسمی جنس بوو وەکوو ئەو ناوانە کە ناون بۆ شت ، خواستنەکە ئەبێ بە ئەســــڵی و رەگەزی ، وەکوو • شێر » ئەخوازرێ بۆ پیاوی ئازا • • ترسنۆك • ئەخوازرێ بۆ پیاوی نەترس و بێ‌باك •

ئەگەر وا نەبـوو ئەبێ بە تەبەعی و رەدوو • ئەمانەش بەهـۆی

کردەوە و موشتەقاتی کردەوەو پێنەوە . بۆ ئەم جۆرەیان من پێویست بە درێژەپێدان نابینم .

* * *

بەهۆی دوایی هاتنی دوو بابەتەی گوزارەکاري و رەوانـــکاریەوە شتێکی‌تر ماوە پێم‌وایە باسی ئەوەش بکرێ :

بەلای هەموو زانایانی بەلاغەوە وایە کە خوازە و درکە پاراوتر و بەهێزترن لە دروست و دان پیانان ؟ واتە « مجاز و کنایە » « بەلێغ‌ترن لە « حقیقە و تصریح » « ئەمەش بۆیە وایە چونکە وەکوو ئەوە وایــە کە تۆ لە «ملزووم» «وە بچیت بۆ « لازم » ، هەموو دەم کە مــەلزووم هەبوو لازم‌ـیش هەیە ، کە ئاگر هەبوو گەرمایی هەیە ؟ کە مەجاز و درکە هەبوو دروست و دان‌پیانانیش هەیە « ئەمە وەکوو ئەوە وایە کــە تۆ داوای شتێـک بکەیت لەگەڵ ئیسبات و گەواهي‌دا « بێ گومـــــان داواکردن لەگەڵ « بینة »دا بەهێزترە لە داوایەک کە ئەوی لـــەگەڵ نـــەبێ .

هەروەها « خواستن »یش بەهێزترە لە وەک یەک « چونکە ئــەم خواستنە ـ وەکوو وترا ـ بەشێکە لە خوازە ، خوازەش بە پێزتر بــوو لە « دروست » « لە باسی « خواستن » دا قسە لە خزمایەتی وەک یەک و خواستن ، وەک یەک و خوازە ، خوازە و خواستن کرا ، لە ئەنجامی ئەو باسانەدا دێنە سەر ئەوە کە خواستن بەهێزترە لە وەک یەک .

# جوانکاري

بەشی سێیەم لە زانیــاري رەوانبێژي ، جوانکاري ،یە تێــــنە ئەچینە ناو ئەو بەشەوە ، زانیاري ئەم بەشەش ئەوەیە کە بەهۆی ئەوەوە جوانیی و رێنک وپێکی قسە دەر ئەکەوێ ، دیارە ئەم دەرکەوتــەش وەختێ ئەبێ کە ئەو قسەیە لەگەڵ چۆنیەتی کاتەکە « مقتضي الحال »دا بەرانبەریی بکا ، وە ئەبێ ئەوەش بهێنرێتە بەر چاو کە ئەو وشە، وە یا رستەیە بە جۆرێــکی ئاشکرا و بێ گرێ و قۆرت لەگەڵ گوزارەکــەدا جووت ئەبن و یەک بۆ یــەک ئەشێن ، ئەم جووت بـــوون و یەک گرتنەش، وە یا زانینی ئەم رێگەیە بە هۆی زانینی زانیاري جوانکاریی‌یەوە ئــەبێ .

کەوابوو زانیــاري « جوانــکاري » تایبەتی‌تر بوو لە زانیـــاري گوزارەکاری و رەوانکاري، لە بەر ئەمە بوو، بۆیە ئەم بابەتی جوانکاریی‌یە کەوتە دوای ئەوانەوە .

ئەم جواني و رێنک و پێــکی قسەیەش دوو جۆرە ؛ جۆرێکیان روو لە وشە ئەکاتەوە ، جۆرێکیان روو لە گوزارە ئەکاتەوە ، لە پێشـــا باســی گوزارەیەکە ئــەکەین ، چونکە مەبەستی بناغەیی لە هەمـــوو شتێکا گوزارەیە ، وشە قاڵبێــکە بۆ ئەو گوزارەیە .

جا یەکێــک لەو گوزارەیانە :

# جواني بايس .

جواني بايس واتـه « حسـن التعليل » يەكێكە لە بابەتــەكانی « رەوانبێژي » و لە بەشی« جوانكاري » ؛ لەو بەشە کە جوانكردنی وتەو رستە ئەگرێتـەوە ، کە ئەیگرێتەوە لە لایەنی روخسار و ناواخـــن و ناوەرۆكیەوە •

جواني بايس لە خودی خۆیا ئەوەیە کە «سەبارەت-عیللەت»ێكی بە رێ و جێ بهێنرێ بۆ « خاسەوێژي - وەسفی » شتێـك کە ئــەو خاسەوێژی‌یە لە بناغەدا خاسەوێژی شتەکە نەبێت ؛ واتە غەیر حەقیـقی بێ ، بەڵام ئەو داواکردنە و ئەو بۆ هێنانە بە شێوەیەکی جوان و شایان بێت •

کردنی ئەم ئیشەش بۆ ئەوەیە کە پاراوي و جوانیەکی‌تر بدا بــە رستە و هۆنراوەکە ؛ دانێکی وا کە دڵ و مێشك زیاتر پێی بگەشێتەوە و ببووژێتەوە •

ئەم جواني بایســـەش ئەکرێ بە چوار بەشــەوە ؛ چونکە ئــەو خاسەوێژی‌یە کە ئەویسترێ بکرێ بە سەبارەت ، یـا هەیە و گومانێك لە بوونەکەیدا نی‌یە و مەبەست ئەوەیە باسی سەبارەتیەکەی بکرێ ، وە یـــا نی‌یە و شوێنی گومانە و ئەویسترێ بوونیەتیەکی بۆ دروستبکرێ و بهێنرێتە ناوەوە و بکرێ بە چەخماخەی شتەکە •

ئەو بەشەیان کەوا هەیە و گومانی تێدا نی‌یەو مەبەست ئەوەیە باسی سەربارەتیەکەی بکرێ ، یـا ئەمەیە بە رەوشت و بە عادەتی نابێ بە سەبارەت هەرچەندە لە راستی‌دا خاڵي نی‌یە لــە ســـەبارەتیەتی - عیللیەت » وە یـا ئەبێ بە سەبارەت بەڵام مەبەست ئەوەیە کە سەبارەتە رەگەزي و نەژادیــەکەی بێ بە سەبارتێـکی دووەمین ، وە یـا بــە واتەیەکی‌تر بێ بە غەیر حەقیـقی بە پێی ئەو شوێنە •

ئەو بەشەشیان کە نی‌یە و ئەویسریٰ بوونیـــەتیەکی بۆ دروســـت بکریٰ ، ئەمیش واتە خاسەویٔژی‌یەکە یـــا ئەشیٰ و ئەگونجیٰ ، یـــا ناگونجیٰ ناشیٰ .



ئەمجا بەشی یەکەم ؛ واتە ئەو بەشەیان کە وا خاسە وێژی‌یەکە هەیە و گومانی تێدا نی‌یە و مەبەست ئەوەیە باسی سەبارەتیەکەی بکریٰ ، وە بە رەوشت و بە عادەتی نابیٰ بە سەبارەت ، وە یا ناویستریٰ بکریٰ بە سەبارەت ، هەر چەندە لە راستی ـ شدا خالی نی‌یە لە سەبارەتیەتی . وینەکەی وەکوو « نالی » ئەلیٰ :

**« لە ترسی تەلعەتت رۆژ هەر وەکوو شێت »**
**« بە ر‌وو زەردی هەلات و کەوتە کێـــوان ! »**

هالاتن و ئاوا بوون بۆ رۆژ خاسەویٔژی‌یەکە و هەیە . بەلام لــە رواڵەتـا سەبارەتیەکی بـۆدەر ناکەویٰ . هەر چەندە لە راستیدا خالی نی‌یە لە سەبارەت . هۆنەر هێناویە سەبارەتیەکەی بەوە هێناوەتەوە کــە هەلاتن و زەرد بوونەکەی لە ترسی پرتەوی روومەتی دۆستەکەیەتی .

سەبارەتی راستەقینەی ئەم خاسەویٔژی‌یە ـ کە ئاوا بوونەکەیەتی ـ لەبەر سووررانەوەی ئەرزە ، بەلام ئەوە ناهێنرێتە بەر چـــاو ، بەلکوو سەبارەتەکەی ئەکریٰ بە ترســـی زۆر پرتەوی روومەتی دۆســـتی ئـــەم .

بەشی دووەم ؛ واتە ئەو بەشەیان کە خاسەویٔژی‌یەکە هەیەو ئەبیٰ بە سەبارەت ، وەلـیٰ مەبەست ئەوەیە کە شتێکی‌تر بکریٰ بە ســەبارەت بۆ ئەوە سەبارەتە بناغەیەکە بیٰ بە سەبارەتێکي دووەمین ، وە یا غەیر راستەقینە و غەیر حەقیـقی .

وینەی ئەمەش وەکوو « سالم » ئەلیٰ :

**« لە سەر سەبزەی چەمەن یاری سوها قەددم کە جیلوەی کرد »**
**« لە سەجدەی خالی لا لێوی بنەوشە گەردنی خـەم بـوو ! »**

گەردن خەم بوون و چەمانەوەی وەنەوشە خاسە ویٔژی‌یەکی بـیٰ

گومانە و بۆی هەیە ، کە سەبارەتە راستەقینەکەی فورس بوونـــی سەرەکەی و بێ هێزی قەفەکەیەتی ، هۆنەر چاو لەوە ئەپۆشـــێ ، خاسەوێژیەکیتر ئەکا بە سەبارەت کە کرنووش بردنیەتی بـۆ خـاڵی لا لێوی دۆست ، خاسەوێژی‌یە بناغەیەکە چووە پلەی دووەمین و بوو بە خاسەوێژیەکی غەیر راستەقینە و غەیر حەقیقی .

بەشی سێیەم ؟ واتە ئەو بەشەیان کە خاسەوێژی‌یـــەکە نی‌یە و گومانی تێدا هەیە و ئەویستری بوونیەتیەکی بـۆ دروستبکرێ و بکرێ بە خاسەوێژی ، وە ئەم بە خاسەوێژی کردنەشی ئەگونجێ و ئەشێ ، وێنەکەی وەکوو ، مەجدی ، ئەڵێ :

**« مینەتی ئیحسانی واشی‌ـم با لە سەر ئەی ئەهلی شەرق ،**
**ترسی ئەو بوو رستگار بوو چـاوەکانی من لە غـــەرق ،**

، واشی ، کەسێکە قسە دێنێ و ئەبا ، واتە « قسەچن » ، قسەچن هیوای چاکەی لێی ناکرێ ، بەڵام هیچ دووریش نی‌یە کەچاکەیەکیش بکا ، چ قەیدی هەیە با بیکا ! ، ئەیکا بە خاسەوێژی و بە پێچەوانەی مەردمیتر ئەبزوێتەوە و ئەڵێ :

خەڵکینە ! ، بزانن کە من چاکەی قسەچنم لە سەرە ، چونکە من لەبەر دووری یارم ئەبوایە بگریامایە ، لە ترسی ئەوە کە نەوەک ئەو من لـەو جۆشی گریانەدا ببینێت و بچێت ئەم گریانە بە بارێـــکیترا بگێرێتەوە بۆ خۆشەویستەکەم هیچ نەگریام ، لە نەگریانەکەم چاوەکانم بـۆ مایەوە ، چـونکە ئەگەر بگریامایە ئەوەندە ئەگریام تـا چـاوەکانم لە ناو دەریـــای فرمێسك دا نقوم ئەبوون و ئەخنکام .

لێرەدا هۆنەر خاسەوێژیەکی دوور لە راستەقینەی داوەتی ـ کـە چاکە کردنی قسەچنە ـ وە ئەگونجێ و ئەشێ .

وە یـا لەم رستەیە دا کە ئەڵێ :

**« دوژمن چاکتر مامۆستایه ! » »**

چەشـــنی شتەو و خاســـەوێژی‌یە دوور لـــە راستەقینـــەکەی ئەدرێتێ » چـونکە لە ترسـی ئەو » پیاو ئەکەوێتە خـــۆی و بێ وەی ئەبێ لە خراپەی »

بەشی چوارەم ؟ واتە ئەو بەشەیان کە خاسەوێژی‌یـەکە نی‌یە و بە تەواوی گومانی تێـــدا هەیە ، وە ئـەویستری بوونیـــەتیەکی بـۆ دروست بکرێ و بکرێ بـــە خاســـەوێژی ، لەگەڵ ئەوەشـــا کـە ناگونجـێ بـەڵام هـەر ئەکرێ » وێنەش بـۆ ئەمەیان وەکوو » بێخود » ئەڵی :

**« ئەگەر جەوزا نیازی بەندەگی شۆخی لە سەر نـــەبوای »**
**» نەدەبینرا کەمەر بەستە لە ســەر ئەو ئەوجی ئەفلاکە !«»**

« جەوزا » ـ کە دووبەیکەرەیە ـ چەند ئەستێرەیەکن لە وێنەی دوو منالی رووت دا، شوێنەکەی شوێنی ئەستێرەی « عەتـــارد » ، وە ناوی مانگی سێ‌یەمی دوانزە بوورجەکەشە » بە هەر چـــوار دەوری ئەم جەوزایەدا چەند ئەستێرەیەک ئاخڵەیان داوە بە دەوریا و بـوون بـە وەکوو پشتێن بۆی ـ کە بەمانەش ئەڵێن « نطاق الجوزاء » ـ »

جا ئەڵێ ئەگەر ئەستێرەی جەوزا مەبەستی بەندەگی‌ی ئـــەو شۆخە ـ کە یارەکەمە ـی لە سەرا نەبوایە » بەو جۆرە پشتێنی بەندەگی لەو سەرەوە نەئەبەست ، بە چەشنێکی وا کە هەموو کەس ببینێ ! »

لێرەدا خاسەوێژی‌یەک ـ کە خزمەتکردنی ئەستێرەی جەوزایـــە بە یار ـ نە » شتێکە بێت ، وە نە ، ئەشگونجێت » هۆنەر وەکوو چۆن ئەیەوێ بوونەتیـــەکی بۆ دروست بکا ، بەو جـۆرە ئەشیەوێ بڵـــێ ئەشگونجێ ! » بوونیەتیەکەی بەوە پێک دێنێ کە ئەڵێ :

نابینی وا بەو جۆرە ئەمەر بەستە و بە بێ هەست بۆ خۆی لەو سەرەوە راوەستاوە ، ئەم راوەستانەی بەو دیمەنە ئەوە بۆ ئەو خزمەتەیە ! •

وە یا « تاهربەگ » ئەڵێ :

**« فەلەک زانی کە دەشکێ رەونەقی بازاڕی مانگ و رۆژ »**
**« شکاندی پەنجەکەم تا من نەنووسم وەسفی روخساری ! »**

تاهربەگ لە « راو »دا بووە ، دەمانچەیەکی تەقاندوە ، بە رێکەوت داویە لە پەنجەیەکی خۆی بریندای کردووە و بەڵکوو سەری پەنجەکەی پەڕیوە • شکانی پەنجەکەی بە هۆی گوللەی ئەو دەمانچەیەوە بووە • کەچی هێناویە خاسەوێژییەکی تری بۆ دروست کردوە ئەڵێ :

گەردوون بۆیە پەنجەی منی شکاند بۆ ئەوە بوو کە وەسفی روخساری یار نەنووسم!• چونکە ئەگەر بمنووسیایە مانگ و رۆژ ئیتر ئەو رەواجەیان بۆ نەئەمایەوە کە مەردم باسی جوانیان بکەن !•



شتێکیتر هەیە بە تەواوی وەنەبێ جوانی بایس بێ ، وە وەنەبێ ئەویش نەبێ ؟ جوانی بایس نییە بە تەواوی ، چونکە بەر ئەو بەشانە ناکەوێ ، ئەویش نییە چونکە لەو ئەکا •

هۆیەکەش ئەوەیە کە ئەو نییە و لەو ئەکا ئەوەیە کە لەمەدا گومانێک هەیە و لە سەر ئەو گومانە دارێژراوە • لێرەدا شێر گیرە لە سەر ئەوە کە بیخاتە بەر ئەو بابەتی جوانی بایسەوە ، گومانەکەش پێچەوانەی ئەو داواکارییەیە• کە ئەمە هەبوو بە ناچاری ئەوترێ ئەمە وەکوو پاشکۆیە بۆی ؛ واتە پێوە لکێنراوە •

جا وێنەی ئەمە وەکوو « پیرەمێرد » ئەڵێ :

**هەوری بەهاران ئەگری بە تــاو**
**بۆیە وا ئەکا بە دەردو زووخاو ؟ .**
**لەیلی شاردۆتەوە لە لای « شندروێ »**
**دڵی پڕ ئەبێ و بۆی ئەگری لە نوێ !**

ئەڵێ هەوری بەهاران بۆیە بە تــاو ، تــاو دێنێ و دەرد و زووخاو هەڵئەرڕێژی، چونکە لەیلی ــ دۆستی لە سەر شندروێ لای عەبابەیلــە شاردۆتــەوە ؛ واتە مەزارەکەی لەوێدایە ، جــار جــار دڵی پڕ ئەبێ لە قوڵپی گریان و بۆی ئەگری ! .

بارانی هەور لەبەر ئەوە نی‌یە ، کە دۆستی لەیل ، لەیلی لــە کێوی شندروێ‌یە . بەڵــکوو لەبەر تەبیعەتی هەورەکەیە ، بەڵام ئــەم ئەیــکا بەوە کە دۆستی لەوێ‌یە . ئەم داواکردنەشی بەو جۆرە گومانی تێدا هەیە ، بەڵام لە سەری هەر ئەڕروا بۆ ئەوە بیــکا بە راســت و لەو گومانە دەرچێ ! .



## ( دژیەك )

یەکێکیتر لەهونەرەکانی جوانکاری « دژیەك » « لەم دژیەکەدا دووشتی نەگونجاو ئەهێنرێن لە رستەدا بەرانبەری یەك ئەوەستێترێن بۆ ئەوە نەوس بە ئاسەوە بۆی بشنێتەوە •

وەکوو ئەوە رووناکی بەرانبەر بە تاریکی ، چاکە بەرانبەر بە خراپە ، بەرزی بەرانبەر بە نزمی ، جوانی بەرانبەر بە ناشیرینی رائەگیرێن « ئەم دژیەکەش وا ئەبێ دوو « ناو » ئەبن « وەکوو « خادم » ئەڵێ : « **ماســـی لە خاکا مردوە ، سۆنە لە ئاوا زیندوە** » « ماســـی و سۆنەی بەرانبەر بە یەك داناوە و ، هەردووکیان « ناو »ن «

وە یــا دوو سفەت ، وە یــا ناو و سفەتێك « وەکوو «سجادی» ئەڵێ :

**« بەرانبەر داد ستەم رابوو ، لە رووی چاکە خــــراپ وەستا »**<br>
**« لە لای پاک پیس سەری هەڵدا ، لە رووی راستی درۆ هەستا »**<br>
**« چ رووناکی ، چ تاریکی ، چ نزمی بێ وە یا بەرزی »**<br>
**« بە خۆشی بێ وە یا تاڵی ، هەموو ئەروا لە سەر ئەرزی »**

تەماشا ئەکەین خاوەن دەق بەرانبەر بە « داد » « ستەم »ی داناوە « بەرانبەر بە چاکە « خراپە » ، بەرانبەر بە پاك « پیس »ی داناوە ــ کــە ئەمانە هەموو « ناو ــ اسم »ن « بەرانبەر بە « راستی » «درۆ »ی داناوە ــ کە « راستی » ئیسمیمەعنا و لە حوکمی سفەتدایە ؛ « درۆ » ئیسمە « « رووناکی و تاریکی » ، « نزمی و بەرزی » ، « خۆشی و تاڵی » ئەمانە هەموو ئیسمی مەعنان و بەرانبەری لە بەینی یەکا پێکردون «

مەبەستەکە ئەوەیە دوو شتی وا کە هەرگیز نەشێن بن بە یەك و

بخرێنه رستەوە و بەرانبـــەر بە یەک دابنرێن ؟ واتە کـە یەکێـکیان هێنرا ئەویتریشیان هەر لە رستەکەدا دابنرێ • رستەش هۆنراو بێ ، یـا پەخشان •

هەروەها لەم بابەتی • دژیەک »ەدا بەرانبەری ئەکرێ لە نێوانـی « وەرگرتن و وەرنـەگرتن ، ئیجاب و سەلب • ، وە • چەســپاندن و نەچەسپاندن ـ ئیسبات و نەفی • ، وە • دوو کردەوە ـ فعل • • وەکوو دیـوان • خادم • ئەڵێ :

« وتم بەو شۆخی چاو مەستەی دڵارا »
« ئەچم بۆ چین • نەچووم • چووم بوخارا ! »

بە راستی ئەم هۆنراوە بۆ هەموو وێنەکانی دەست ئەدا ؛ «چین» و « بوخارا » بۆ دووئیسم • « ئەچم » و «نەچووم» بۆ ئیجاب و سەلب • «نەچووم» و «چووم» بۆ ئیسبات و نەفی • «ئەچم» و «نەچووم» بۆ دوو فعلەکە •

وە یـا هەر بۆ ئیجاب و سـەلبی تەنها • وەکوو ئەڵێ :

« نازانن دیواخانی پاشا • ئەزانن ئاشخانەی پاشا ! » •

وە یـا دوو مەعنا لە رستەیەک کۆ بکرێتەوە • وەکوو • رەمزی » ئەڵێ :

« لە گریەی زۆری من ، خەندەی کەمی تۆ »
« هەموو دنیا بوەتـــە شین و رۆ رۆ ! »

دوو مەعنـاکە لێرەدا لە راستیدا ئەبێ بە چوار ؛ زۆر و کـەم ، گریان و پێکەنین ؛ جوانیەکە لەوەدایە کە • گریان »و • زۆری » بەرانبەر بـە پێکەنین و کەمی داناوە • ئەمە بەو ناوەشەوە ناو ئەبرێ کە بـۆنی دژیەکی لێدێت •

وە یـا بۆ بەرانبەری یەک شت بەرانبـــەر بە دووشت ئەڵێ :

« پیري به تەنیـــا رەحمەتە »
« پیری و فەقیری زەحمەتە »

* * *

هەر لەم بابەتی « دژیەک »ەدا شتێکیتر هەیە کە بەلای زانایانی بەلاغەوە بە « تەدبیج » واتە « نەخش و جوانیی » ناو براوە . وێنەی ئەمە وەکوو « گۆران » ئەڵێ :

**« خەلات کرا لەو رۆژەدا بە بەرگی سووری مەخمەلی »**
**« دەنگ هات شەوێ بە شوێن ئەوا کە بۆی کرا بە ئەتلەسی ! »**

ئەمە هەڵئەگرێ کە دژیەکەکە بێ « طباق » ، چونکە دوو دژیەکی کۆ کردۆتەوە ، واتە دوو مەعنای بەرانبەر لە رستەیـەک دا . وەکـــوو ئەمە هەیە ئـەوەش هەر هـەیە کە ئەم جۆرە دژیەکە بـــە نـەخش و جوانیـش ناو ئەبرێ ؛ واتە لە شتێکا ئەبێ کە وەسف یـا خوسپی تێـدا هەبێ ، رەنگ و رەنگامەی تێـدا بەکار بهێنرێ بە نیازی « درکە » یـــا « توانجپۆشی » .

« هەڵۆ » بەگ یەکێـک بوو کە لە رۆژی شەشی ئەیلـــوولی « ۱۹۳۰ » لەبەر دەرکی سەرای سولەیمانیدا کوژرا . عبداللە «گۆران» لاوانەوەیەکی بۆ دانا . ئەم هۆنراوەیە یەکـێکە لەو پارچەیە .

لێرەدا ئەمە هەڵئەگرێ ـ بێجگە لە دژیەکیەکەی ـ کە « تەدبیجی درکە » بێ ، چونکە ئەڵێ :

ئەو رۆژە کە هەڵۆ بەگ کوژرا بەرگی سوور کرا بـە خەلاتی ـ کە خوێنەکەیەتی و شـەهید بوو ـ . هەرکە کەوتە شـــەوێ چوە بەهەشتەوە و بەرگی سەوزی ئەتلەسی کرا بە بەرا . ئەتلەس سەوزە . لێرەدا سوور و سەوزی کۆ کردۆتەوە . مەبەستی لە « سوور » درکەیە لە کوشـتنی . مەبەستی لە « سەوز » درکەیە لـە چوونە بەهەشـت ، چونکە جل و بەرگی ئەهلی بەهەشت سەوزە .

« درکە »ش ئەوە بوو : کە گوزارەیەک هەیە « وشەکە لەگوزارە ئەسڵیەکەی خۆی گوێزراوەتەوە بۆ گوزارەیەکی‌تر ، لەگەڵ ئەوەشا ئەگونجێ بۆ ئەسڵەکەش ؛ واتە نیشانەیەک لە ئارادا نی‌یە بۆ ئەوە گوزارە ئەسڵیەکە مەبەست بێ .

« سوور » رەنگی سوورە « قرمز » . «سەوز» رەنگی سەوزە « کەسک » . « خوێن رەنگی سوورە ، بەرگی ئەهلی بەهەشت رەنگی سەوزە . لێرەدا نیشانە نی‌یە کە سوور هەر ئەبێ سووری «مصطلح » بێ ، وە یـا « سەوز » ئەو سەوزە بێ کە لە ناو زمانا باوە .

وە یا هەر لەم بەشدا « رەنگامە » بە جۆری « توانج پۆشی » بێتە پێشەوە . وەکوو لەم رستەیەدا ئەڵێ :

« **لەو رۆژەوە کە گیای سەوزی ژیانم زەرد هەڵگەررا . خۆشەویستی زەردم پشتی تێی کـــردم . رۆژی رووناکم پەردەی رەشی بەســـەردا هاتووە . رەشی‌ی مووەکانم روو بە رووی سپێتی بوونەوە . کەوتمـە حاڵێکەوە کە دوژمن بەزەیی پیاما ئەهاتەوە . لەو رۆژەوە کە وام لـــێ هاتووە . ئیتر خوزگە بە مردن ئەخوازم !** » .

لێرەدا رەنگەکان ؛ سەوزي ، زەردي ، رەشی ، سپێتی هەمووی هێناوە . « توانــج‌پۆشی »یەکە لەم شوێنەدا لە « زەردی »یـــەکەدایە ؛ « خۆشەویستی زەرد » دوو مەعنای هەیە ؛ یەکێ نزیکەکە کە دۆستـە گەنم رەنگە زەردبادامیەکەیەتی ، یەکێ دوورەکە ـ کەزێـــرە ـ . مەبەستەکە لێرەدا دوورەکەیە .

هەر لە بابەتی « نەخش‌وجواني »یە ، دوو مەعنا کۆ بکرێنەوە و بە دوو وشە گوزارشت لێی بدرێنەوە کە مەعنا راستەقینـــەی وشەکان بەرانبەري بکەن . وێنەی ئەمە وەکوو « پیرەمێرد » ئەڵێ :

**« بزەی پیری‌یە بە سەروریشم »**
**« گریانی خۆمە بە دەورەی ئیشم ! »**

هەر چەندە پیری بەرانبەری گریان نی‌یە ، بەڵام لە مەعنادا بەرانبەرە ، چونکە گوزارشتی بە « بزە » لێی داوەتەوە – کە بزە بە مەعنا پێکەنینە – پێکەنین لە راستیدا بەرانبەرە بە گریان . جگە لەمەش گەلێ پێکەنین روو ئەدا بەرانبەر بە گریانی کەسێک ، چونکە ئەم بەتەوسەوە بە گریانەکەی ئەو پێی ئەکەنێ ! . ئەمە بە « ایهامی تضاد »یش ناو ئەبرێ .

* * *

بەشێکی‌تر لە جوانکاری گوزارەیی لە لای زانایانی بەلاغە لەسەر گوزارشتی ئەوان « مرعات النظیر »ە . ئەم رستە بە لای منەوە لە رەوانبێژی کوردی دا **«چاو لەیەک»** جێگای خۆیەتی ، وە نابێ واش بزانین کە رستەی « چاو لەیەک » وەرگێڕراوی « مراعات النظیر »ە . وەرگێڕراو نی‌یە ، چونکە مەعنای حەرفی « مراعات النظیر » شتێکی‌ترە . بەڵکوو من ئەو چەمکەم گرتووە کە زمانێکی وەکوو عەرەبی بە پێی کەسیەتی خۆی « مراعات النظیر »ی بۆ داناوە ، زمانی کوردی‌یش کەسیەتیەکی بۆ خۆی هەیە ، بە پێی ئەو کەسیەتیەی چەمکی «مراعات النظیر »ی بە « چاولەیەک » گوزارشت لێ داوەتەوە . کە وا بوو ئەمە ئاشنایەتی بە وەرگێڕانەوە نی‌یە .

ئەم « چاولەیەک »ەش چەند شتێکە ، یەکێک لەوانە «گونجاو بۆ یەک »ە ؛ واتە « تناسب و توفیق » .

ئەمەش ئەوەیە کە دوو مەعنای نەگونجاو کۆ بکرێنەوە لە دوو رستەدا ، ئەمەش بە رێکەوتی شوێنەکە بێ ، نەوەک بە هۆی دژایەتیەوە بێ . کە کۆ کرانەوە لە دوو وشەکەدا ، گوزارەی وشەکان لەگەڵ یەکا بگونجێن . وەکوو وێنەکە ئەڵێ :

**« ڕۆژ لە ڕۆژدا و مانگ لە مانــگ دا لە گەڕرانا بــوون »**
**« گەلاوێژ لە مانگدا و ژین لە حەفتەدا لە سەمادا بوون »**

وێنەکە لە ڕۆژ و مانگ و گـــەلاوێژ دایە ؟ ڕۆژ کوورەی ڕۆژ مەبەستە ، هەر چەندە بە ڕۆژی بەرانبەر بە شەویش ئەوترێ • مانگ ئەو مانگەیە کە لە شەوا هەڵدێت ، هەر چەندە بە « ٣٠ » ڕۆژەکەش هەر ئەڵێن مانگ • «گەلاوێژ» ئەو ئەستێرە ڕووناکەیە کە لە شەوی «٤٦»ی هاوین دا لە شوێنی خۆی ئەکەنرێ ، وە گۆڤارێکی کوردیی ئەدەبی ـش بووە کە هەر بە مانگێ جارێ لە بەغدا دەرچووە •

گەلاوێژی ئەستێرە ڕێکەوتی لەگەڵ مانگ و ڕۆژ دا هەیە چونکە هەموویان ڕووناکن ، بەڵام گەلاوێژی گۆڤار ئەو ڕێکەوتەی لەگەڵیانا نی‌یە ، چونکە ئەوان لە ئاسمانن و ئەم لە ئەرز ، ئەوان ئەو ڕووناکی‌یە ڕواڵەتیەیان هەیـــە ئەم نی‌یەتی • وە یـــا هەر لەم ڕووەوە • نالـی • ئەڵێ :

**« گریانی من و خەندەی تۆ ئێستە ئەشوبهێن »**
**« بەو مەوسمی بارانە کە وا خونچە ئەپشکووت »**

ئەم هــۆنراوە بۆ گەلێ لە هونەرەکانی ڕەوانبێژی دەســت ئەدا • هەر یەکە بە پێی جێگای خۆی •

● ● ●

جۆرێکی‌تر لەم « چاولەیەک »، ئەوەیە کە ڕستەکە بـــە جۆرێ دابڕڕێژرێ دوایەکەی لەگەڵ سەرەتاکەیا گونجایشێـک لە بەینیانـــا هەبێ • ئەمە « تشـــابهی ئەتراف »یشی پـێی ئەڵێن • وێنـــە وەکـــوو • نالی • ئەڵێ :

**« فەرشی پلاسە ، دۆشەکی خاکە ، سەرینی بەرد »**
**« بێ تووک و ڕووت و قووت و فەقیرو قەلەندەرە »**

سەیر ئەکەی فەقیر و قەلەندەر لەبەر بێ نەواییان فەرشیان هـــەر پلاسە •

* * *

یەکێکیتر لە جوانکاری گوزارەیی « چاوەڕوانی »یە . ئـەم گوزارشتە لە عەرەبیدا « ارصاد »ی پێ ئەڵێن ، هەروەها « تسهیم »یشی پێ ئەڵێن . ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە گوایە رستەکان لە رێکیدا بە ئەندازەی یەکن .

جا ئـەم « چاوەڕوانی »یە ئەوەیە بە جۆرێ رستەکان دا بڕێژرێن کە بە هۆیەوە چاوەڕوانی دوایەکەشی بکرێ ، واتە لە پێش دوایی هاتنی رستەکەدا شتێک هەبێ کە پەیوەندي لەگەڵ ئاخرەکەدا هەبێ ، وەکوو بڵێیت شاترێکە بۆ ئەو و تروسکەیەکە بـۆ ئەوە ئەو پیشان بـدا . بـە وێنە وەکوو ئەڵێ :

« **لە سایەقەی سامالی ئاسمانی مەریواندا گوڵۆپێکی کارەبا . لە لالەزاری پڕرنیگاری دەوری زرێباردا بولبولێکی خوش نەوا ! »** .

تەماشا ئەکەی لە پێش « کارەبا » و «خوش نەوا » ـ کە ئاخری رستەکانن ـ «گوڵۆپێکی» و «بولبولێکی» داناوە ، کە ئاخرەکان ئـەوان ئەدەن بە دەستەوە و ئەوانیش رێگایەک روون ئەکەنەوە بۆ پیشاندانی ئاخرەکە .

وە یا ئەڵێ :

« **لە دیمەنی بەهارە رەشماڵی کۆچەري کۆچـەران و چـووزەرە رێواسـی نـاو کەما و لۆی کۆسـەران** » ـ کۆسـەران کورتکـراوەی « کۆساران »ە .

هەر لە سەرەتـاوە گوێ بۆ رائەگرێ و لە هەر وشـەیەکیا چاوەڕوانی وشەکەی دوایی ئەکا . ئەمە بە چاو گوێگرەوە . بە چاو رستەکەشەوە کۆچەري بۆ کۆچـەران و کەما و لۆ بۆ کۆسـەران پێرەۆێکن .

* * *

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاریی گوزارەیی « کۆڵەوانــە »یە • بۆ ئەم بابەتە ئەهلی بەلاغەی عەرەبی بە « مشاکله » ناوی ئەبەن • بەڵام مــن بە پێی چەشەی کوردی بە « کۆڵەوانە » ناوی ئەبەم •

ئەم کۆڵەوانەیەش ئەوەیە کە تۆ ناوی شتێـک بەری بە غەیری ئەو وشەیە کە بۆ ئەو دانراوە ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە شــتەکە لەگەڵ غەیرەکەدایە • وێنەی ئەمە وەکوو ئەڵێ :

جارێک مەحموو پاشای جاف بە فەقێ شێتە ئەڵێ :

« **چیت ئەوێ تا بۆت لێنێن** » ئەویش ئـەڵــێ : « **پاشــا ! کەواو سەڵتەیەکم بۆ لێنێن !** » • واتە « بۆم بدروون »• ناوی کەوا و سەڵتەی هێناوە بەناوی « لێنانەوە » لەبەر دراوسێتی • ویستوویە بڵــێ کەوا و سەڵتەم بۆ بدروون • « لێنان » بۆ خواردنە • « دروون » بۆ لەبەر کردنە• ناوی دروونی بە ناوی لێنانــەوە هێناوە ، چونکە دروونەکە لەگــەڵ خواردنەکەدایە •



یەکێــکی‌تر لەو هونەرانە « کۆکردنەوە »یە • ئەمە لە گوزارشتی عەرەبی دا بە « مزاوجه » ناوی دەرکردووە •

ئەم کۆکردنەوەش ئەوەیە کە دوو مەعنا لەنێوانی ئەو رستەیەدا کە شەرت و جەزای تێــدایە کۆ بکرێتەوە • بە وێنە « عارف ســائب » ئەڵێ :

« **ئەگەر مەنعم بکەن لەو ، عەشقەکەم زیاتر ئەبێ بێشک** »

« **ئەگەر گوێ با بە «واشی» ئەو ، رەمی زیاتر ئەبێ بێشک** »

گوزارەکــەی ئەڵێ : ئەگەر خەڵکی مەنع و لۆمەم بکەن بــۆ ، وە لە سەر ئەوە کە من شەیدای ئەو دۆستەمم و لە رێگای ئەوا وەکوو دێوانەم

لێهاتووە ، بێگومان هەتا زیاتر رێم لێبگرن ، عەشقەکەم بەرانبەر بەو هەر زیاتر ئەبێ ، ئەگەر خۆ ئەویش گوێ بدا بە قسەی قسەچن ، سڵکردنەوەو دوور کەوتنەوەی لە من زیاتر ئەبێ و فرەتر دوور ئەکەوێتەوە ! .

لێرەدا دوو شتی کۆکردۆتەوە ؛ یەکێ مەنع‌کردنی لە دۆستی ـ مەعشۆقی ـ ، یەکێ گوێ راگرتنی مەعشۆقەکەی بۆ قسەی قسەچن . لە نێوانی شەرت و جەزاکەدا لەم مەنعەی ئەو و گوێ راگرتنی یارەکەی یەک شت روو ئەدا ؛ یەک شتەکەش سوور بوونی هەر دووکیانە ؛ واتە ئەو سوورە لە سەر عەشقەکەی و دۆستەکەشی سوورە لە سەر دوور کەوتنەوەی لەو . شەرت و جەزاکەش مەنع کردنو عەشقە زیاددەکە ، وە گوێ گرتن و سڵ کردنەوەکەیە .

بەکورتی هەر دووکیان یەک رێگایان گرتووە کە « زیاتر »ەکەیە ؛ ئەویان زیاتر لە دێوانەیی‌دا ، ئەمیان زیاتر لە دوور کەوتنەوەدا ! .

* * *

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری گوزارەیی « جێگۆررکێ »یە . ئەمە بەلای ئەربابی بەلاغەی عەرەبی‌یەوە بە « عکس » ناو ئەبرێ ، بەڵام من بەلامەوە « جێگۆررکێ » ئەو چەمکە زیاتر ئەدا بە دەستەوە ؛ چونکە لەم جێگۆررکێ‌یەدا ئەوەیە کە تۆ بەشێک لە رستەکە پێش خەی ، پاشان هەر ئەو بەشە هەڵگریت و پاشی خەی . ئەمەش دوور نی‌یە لە چەند رێگایەکەوە بکرێ .

وەکوو ئەوە رستەکە دوو لای هەیە تۆ جێ گۆررکێکە لەبەینی یەکێ لە لایەکانیا بکەی . وێنەی ئەمە « شێخ محمدی مەردۆخ ـ ئایت .

الله ـ ، پشیلەیەکی کەللە زلی ئەبێ . لێی ئەپرسن : ئایت الله ! ، ئەم پشیلە کەللە زلە چی‌یە ؟ . ئەویش ئەڵێ : « کتکی ئایـتالله ، ئایت اللەی کتـک گەلە ! . » کتک بە مەعنا پشیلەیە . ئەمە وێنە بوو بۆ « ناو »، ئەگونجێ کردەوە لە ناو دەربهێنرێ ، وەکوو ئەڵێ :

« هێلکە لە مریشکە و مریشک لە هێلکەیە » . ئەمە جگە لەوە کە یەکەم وشـەی رستەی گواسنۆتەوە و خستوویەتـە دوای دواوە ، کردەوەیەکیش لە ناوا هەیە ـ کە پەیدا بوونە ـ ؛ هێلکە و مریشکەکە بەستراون بەوەوە ، یەکەم جار هێلکەکەی پێش مریشکەکە خستووە ، دووەم جار مریشکەکەی پێش هێلکەکە خستووە .

وە یـا « حەریق » ئەڵێ :

« حوبابی ئەشک و حەسرەت بووتە فنجانی سەر و سینەم »
« لە جێ دەستەگولا لێدمن ، ئەلێن گولدەســـتەی تۆیە ! »

جێ گۆررکێیەکە لـــە نێـوانی « دەستەگوڵ » و « گوڵدەستە » ـ دایــــە .

* * *

یەکێـکیتر لەو هونەرانە « گەررانەوە »یە ، بەلاغەی عــەرەبی ئەڵێ « رجوع » . واتە ئەگەررێتەوە بۆ قسەی پێشوو بەڵام بە کورتی و ناتەواوی‌یەوە . ئەم گەررانەوەشە لەبەر دەردە دڵێکە ، ئەم دەردە دڵـە ئەکرێ بەهۆی ئەو گەررانەوەیە، ئەگەر وانەبێ شتەکە بەدرۆ دەرئەچێ . وێنەش بۆ ئەمە وەکوو « حەمەمین » بەگی جاف ئەڵێ :

« جێ بگرە لە شوێن ئەو ماڵە گەورە»
« جێگای بەگزادە و پیاوانی گەورە »
« واز بێنە مەررۆ ، دنیای چەواشــــە »
« ئەوێشی کردە شوێن بووم و واشە !»

تەمانا ئەکەی سەرەتا بە دڵێکی خۆشەوە ئەڵێ بچۆ بـۆ شوێن

هەواری ماڵەگەورە کە جێگای بەگزادەکانی جافە و جێگایەکی تا ئـەو پەرری خۆشـي خۆشە . « ماڵە گەورە » ناو بووە بۆ دەواری مەحمـوو پاشای جاف .

پاشان پەشیمان ئەبێتەوە و ئەڵێ : مەچوو چونکە چەرخی چەواشە ئەو شوێنەشی کوێر کردەوە و کردی بە جێگای واشە و کوننە بەبوو !. لەبەر ئەم دەردە دڵە قســەی پێشوی خۆی هەڵئەوەشێنێتەوە و لــێ‌ی پەشیمان ئەبێتەوە .

* * *

یەکێـکی‌تر لە هونەری جوانکاري گوزارەیی « **توانج‌پۆشی** »یە. کە ئەمە لە بەلاغەی عەرەبی‌دا بە « **تەوریە** » ناو ئەبرێ . لە کوردي‌دا بە « پۆشیـن »یش هــــەر ناوبراوە ، بەڵام بە لێـــکدانەوەی من « توانج‌پۆشی »یەکە لـــە بارترە ، چونکە « پۆشین »ەکە زیاتـر رووی رەخنەی ئەچێتە سەر .

جا ئەم « توانج‌پۆشی »یە ئەوەیە کە وشەیەک هەبێت دوو گوزارەی هەبێ – کە زۆرتر لە وشەکانیش هەر وانە – ؛ یەکێ دوور ، یەکێ نزیک . تۆ بەهۆی نیشانەیەکی پۆشراوەوە دوورەکەت مەبەست بێ . تەنانەت لەوانەیە ئـەگەر زیـرەکیـەک و ئەدیبیـەک لـە ئارادا نەبـێ گوێگر هەر نەچێ بۆ گوزارە دوورەکە. وە یـا جاری وا ئەبێ ئەگەر سەرگوزەشتی گوزارە دوورەکە نەزانرێ ، پیاو هەر بۆ گوزارە نزیکەکە ئەچێ .

ئەم « توانج‌پۆشی »یە هەندێ جار بە « ایهام »یش ناو ئەبرێ ، چونکە پۆشراویەکی تێدایە و لەوانەیە بیرەکە بۆ شتی‌تر برروا .

« توانجپۆشـــی » ئەبێ بە دوو بەشەوە ؛ « رووت ــ مجـــرد » ، « باڵاوتە ــ مرشح » :

« رووت »ەکە ئـەویە ئەگەر نیشانەش هەبێ هـەر لەگەڵیا کۆ نابێتەوە و هەر مەعنا دوورەکە ئەگرێتەوە ـ وەکوو ئەڵێ :

**« ئەرز لە سەر شاخی گایە ، گا لە سەر ماسی‌یە ، ماسی لە سەر ئاوە ، ئاو لە سەر بایە ! »**

ئەمانە دوو گوزارەیان هەیە ؛ یەکێ ئەوە بەچاو ببینرێن ، یەکێ ئەوە کە هەر ئەفسانە بێ و نەبینرێن ـ مەعنا نزیکەکە نی‌یە چونکە ئەوەتە بەر چاوامان ناکەوێ کە ئەرز لە سەر شاخی گا .. هتد بێ ـ کەواتە چار نی‌یە هەر ئەبێ مەعنا دوورەکە بێ ، ئەو نابینرێ ، ئیتر بابەتەکە واقعە ، یا واقع نی‌یە ئەمە شتێکی‌ترە ـ

« باڵاوتە »کەش وەکوو « نالی » ئەڵێ :

**« دنیا کە گوڵـگوڵی بووە قوربان ئەتـــۆیش وەر »**
**« تالب بە گوڵ بە ، قەیدی چی‌یە گوڵ گوڵی بوێ ! »**

تەماشا ئەکەین کە ئەڵێ « گوڵ گوڵی بوێ » ، ئەو گوڵە گوڵـی باخە و « زمان » بە گوڵی ناو ئەبا ، کەچی مەبەستیش دۆستەکەیەتی کە ناوی بە گوڵ بردووە ـ

وە یا « شێخ رەزا » ئەڵێ :

**« گەرچی فەقیرو موفلسە شێخ مامە سالـحم »**
**« نەم دی کەسێ وەکوو ئەو ساحبی کـەرەم »**
**« میوانی بووم نان و کەرەی نایـــە بەر دەمم »**
**« ئیستەش بە بێ موداهەنە مەمنوونی ئەو کەرەم! »**

وشەی « کەرە » دیارە چی‌یە و ئەوەیە کە مەشکە ژەنرا لـە ناو

مەشکەکەی دەر ئەکەن ، کەچی گوزارەیەکی دووریش هەڵئەگرێ لـە کاتێکا کە ئەڵێ « ئەو کەرەم» مەبەستی مامە شێخساڵحی بێ ، بە «کەر»ی دا نابێ ! . ئەمە گوایە مامە شێخ ساڵحی پیاوەتی لەگەڵ کرد ! ..

* * *

یەکێکی‌تر لە هونەرەکانی جوانکاري « پچڕران » ئەم هونەرە لە لای بەلاغەی عەرەبی « استخدام »ی پێی ئەڵێن ، بەڵام من ئەگەڕرێمەوە سەر بناغەکەی و بە « پچڕران » ناوی ئەبەم « چونکە :

ئەم هونەرە بڕیتی‌یە لەوە کە وشەیەک لە رستەیەک‌دا بوترێ ، ئەو وشەیە دوو گوزارەی هەبێ ، پاشان راناوێکی بۆ بگێرـڕێتـەوە « مەبەست بە ئەسڵی وشەکە گوزارەیەک بێ « وە بە راناوەکە گوزارەکەی تری . ئەمە لە ڕاستی‌دا بە راناوەکە ئەپچڕێ لە ئەسڵەکە « کەوا بوو « پچڕران » دروستتر بوو لە « استخدام » « چونکە « استخدام » بـــە خوازەیەکی تەواو بۆی دانراوە «

جا وێنە بۆ ئەم « پچڕران »ە وەکوو « شەیدا » ئەڵێ :

**« لە شەممەدا مـــن ئاگـــرم نابێ »**
**« چونکە ئاگردان لەوێ‌دا نابـــێ »**

« شەممە » ناوی دێکە لە وڵاتی سولەیمانی ، وە ناوی یەکێ لـە رۆژەکانی حەفتەشە « کە ئەڵێ « ئاگردان لەوێ دا « راناوی « لەوێ » بۆ شەممە ئەگەڕرێتەوە «

لە کاتی خۆیا « شەلەمۆ » هەبوو جوولەکە بوو ، لە دێ شەممـە دائەنیشت « ئەگونجێ « لەوێ »دا « دێ شەممە بێ « وە ئەگونجێ ئەوە

بێ کە لە ڕۆژی شەمموانا ئەو ئاگری نابێ چونکە جوولەکەیەو جوومەکە لە شەوو ڕۆژی شەممەدا ئاگر ناکاتەوە ! »

★ ★ ★

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاریی گوزارەیی « پێچە و بەخشە »یە، ئەم هونەرە تا ئێستە هەر بەناوی « لف و نشر »ەوە ناو براوە ، بەڵام بەلای منەوە لەبەر ئەوە کە قسە لە ڕەوانبێژیی کوردی‌یەوە ئەکەین ، ڕستەی « پێچەوبەخشە » بەتەواوی پڕر بە پێستی ئەو چەمکەیە کە « لف و نشر »ی بۆ دانراوە »

هەندێ لە زانایان بە لایانەوە وایە کە « پێچە و پەخشە » ئەبێ لە ناو بابەتی « وەک‌یەک »دا بێ » بەڵام بڕروای من جیایە ، ڕاستە گەلێ لە وێنەکانی « پچە و پەخشە » ئەگەر لە باری « وەک‌یەک »ەوە سەیر بکرێ ئەگونجێ بۆ ئەوێ » بەڵام ئێمە ئەبێ تەماشای بابەتەکان بکەین ؟ بابەتی « وەک‌یەک » لە بەشی « ڕەوانکاریی ـ بەیان »دایە » بابەتی « پێچە و پەخشە » لە بەشی « جوانکاریی گوزارەیی »دایە » کە وابوو شوێنەکەی هەر ئەم شوێنەیە »

ئەمەو دیسان ئەگەر شتێک یەکێک لە هونەرەکانی ڕەوانبێژیی بە سەرا سەرەونخوون کرایەوە » مەعنای ئەمە ئەوە نی‌یە کە ئیتر نابێ بەر هونەرێکی‌تر نەکەوێ ! » هەرچەندە ئەگەر سەیری گەلێ لە بابەتەکانی « ڕەوانکاریی »یش بکرێ » سەیر ئەکەی لە هونەری « جوانکاریی » تێدایە ، وە ئەبێ تیشیا بێ چونکە هەموویان بەلاغەن ، بەڵام ئەبێ اعتباراتێک هەر هەبێت بۆ جیاکردنەوەیان »

جا ئەم هونەری « پێچە و پەخشە »یە ئەوەیە کە خاوەن دەق لە ڕستەکەیا « دوو » وە یا زیاتر لە دوو شت ئەڵێت ، پاشان بە شوێن

ئەوانا بە ئەندازەی ژمارەی ئەوان چەند وشەیەکی‌تر دێنێتەوە ، کە ئەم وشانەی دوایی لە رووی گوزارەوە هەر یەکەیان روو ئەکەنەوە لەوانەی پێشوو وە بۆ ئەوان ئەگەڕرێنەوە .

ئەمانەش وا رێ ئەکەوێ بە رێک و پێکی ئەبێت ؟ واتە یەکەم وشەی رستەی دووەم روو لە یەکەم وشەی رستەی یەکەم ئەکاتەوە ، دووەمی دووەم بۆ دووەمی یەکەم و هەروەها .

وە یا نارێک ئەبێت ؟ واتە وشەی یەکەمی رستەی دووەم بۆ وشەی دووەمی رستەی یەکەم ، وە دووەمی دووەم بۆ یەکەمی یەکەم ئەگەڕرێتەوە ، هەروەها رێ ئەکەوێ سێیەم بو دووەم بچێتەوە. بەلای هەندێ لە زانایانی رەوانبێژی‌یەوە ئەم « پێچە و پەخشەی » نارێکە پاراوترە لە رێکەکە ، چونکە دڵ ، بۆ زانینەکەی ، زوو روو بە رووی ئەبێتەوە .

وێنەی رێک وێکەکە وەکوو « ئەدەب » ئەڵێ :

**« بە زولف و ئەبرۆ و موژگان ، بە خەت و پەرچەم و بالا »**

**« کەمەنــد و تیغ و تیرو جەوشەن و خەفتــان والایی »**

هەموو وشەکانی نیوە هۆنراوەی دووەم بە ریزە ئەچنەوە بۆ هەموو وشەکانی نیوە هۆنراوەی یەکەم ؟ واتە پێنج بە پێنج .

وە یا « زێوەر » ئەڵێ :

**« تکا ، شکا بە جارێ شەراب و شیشەی دڵ »**

**« ئەسراری مەخفیاتم کەوتۆتە سەر زبانــــم »**

تکا بــۆ شـەراب و شــکا بۆ شیشــە بــە رێکي بەرانبەری یەک وەستاون .

بۆ نارێکەکەش وەکوو « تاهر بەگ » ئەڵێ :

**« برۆ و روخسار و زولف و لێوی ئـاڵـت »**

**« شەو و رۆژ و هیلال و لەعل و مەرجـان »**

لە نیوە هۆنراوەی دووەما « شەو » کە لە پلەی یەکەمایە بۆ «زوڵف» ئەچێتەوە ، کە ئەم زوڵفە لە نیوە هۆنراوەی یەکەما لە پلەی سێهەمی ریزی وشەکانە ، « هیلال » لە نیوەی دووەما لە پلەی سێهەمایە بـۆ « برۆ » ئەگەڕێتەوە ، کە ئەم برۆیە لە پلەی یەکەمایە لە نیوە هۆنراوەی یەکەم دا .

وە یا ئەم رستەیە کە ئەڵێ :

**« پاوەن و ماڵ و پیاوانمـان »**

**« کوشتیان ، بردیان ، سووتانیان »**

« کوشتن » بۆ پیاوان ، « بردن » بۆ ماڵ ، « سووتان » بۆ پاوەن ئەگەڕێنەوە .

وشەکانی رستەی دووەم بە ناڕێکی هەر یەکە ئەچنەوە بۆ ئـەو وشانەی کە لە رستەی یەکەم دان .



لە هونەری جوانکاری‌یە « کۆکردنەوە ـ جمع » .

ئەمەش ئەوەیە کە چەند شتێک کۆ بکرێتەوە بۆ ئەوە یەک حوکم بە سەر هەموویانا بدرێ ؟ واتە هەموویان ئەو خێوەتە دایانبگرێتـەوە . وەکوو « شاهۆ » ئەڵێ :

**« گوڵ و رەیحانە و بەردمزا و نێرگس »**

**« بوونیان بۆ بۆنە ، نە وەک بۆبیکس »**

واتە دروستبوون و پەیدا بوونی ئەم شتانە بۆ ئەوەیە بۆنیان بکرێ، نەوەک بکرێن بە چەپک و ببرێن بۆ « بیکس » کە ئنگلیزێک بووە لە عێراقدا .

وە یا « وەفایی » ئەڵێ :

**« سەف بەستە هەموو مونتەزری ئەمرو نگاهن »**

**« قوللابی موژە و چاوی رەش و گۆشەی ئەبرۆت »**

موژە و چاو و ئەبرۆ هەموو چاوەڕێ حوکمێـــک ئـەکەن کە فەرمان و سەیرکردنی یارە فەرمانیان پێ‌ی بکا .

لـــە وێنـەی یەکەمـا حوکم لـە دواوەوەیە ، لە هی دووەما لـە پێشەوەیە .



هونەرێکی‌تری جوانکاري گوزارەیی « بڵاوکردنەوە ـ تفریق »ە .

ئەمەش ئەوەیە کە سفەتێک هەیە دوو شت تیایا هاوبەشن ، تۆ دێنی ئەو سفەتە بە جۆرێک جیا ئەکەیتەوە و بەشیان ئەکەی وەکوو دژایەتی لە بەینیانا بێ وای لێ دێ . وێنە وەکوو « زێوەر » ئەڵێ :

**« ئەڵێن شەجیع بووە ئەفراسیابی تورکی قەدیم »**

**« نە گەیوەتە قولی ئەفراسیابی هەورامـــــی »**

**« هەمیشە ئەو لە دەس ئێرانی هەر فراری ئەکرد»**

**« وەلێ ئەم ئێستەکە ئێران ئەخاتە سەر سامي !»**

سفەتێک هەیە کە شەجاعەت و ئازایەتی‌یە ، ئەفراسیابی توورانی و ئەفراسیابی هەورامی هـــــەر دووکیان تیایا هاوبەش بوون . هات ئـەم جیایەکی تـــەواوی خستە بەینی ئەم دوو ئازایەتیەوە ؟ ئەڵێ شەجاعەت و ئازایەتی ئەفراسـیابی هەورامي ئەوەنـدە لە پێشەوە بوو ، ئەفراســـیابی توورانی بە تۆزی قولیشیا هەر نەئەگەیشت ! .



یەکێکی‌تر لـــە هونەری جوانکاري گوزارەیی « بەشـــــکردن ـ تقسیم »ە .

ئەم بەشکردنەش ئەوەیە کە چەند شتێک بوترێ ، پاشان بە ئەندازەی

ژمارەی ئەوان شتی‌تر بوترێ و هەر یەکە لەمانەی دوایی روو بە رووی ئەوەی پێشوو بکرێتەوە ، بە مەرجێ کە « دەست‌نیشان ـ تعیین »ی تێدا دەرکەوێ • وێنە وەکوو « قانع » ئەڵێ :

**« دووشت دەر ناچن لە ژێر زیللەتــا »**
**« کەری قەجەری و مێنجی ســـەر سەختا »**

**« ئەویان رەشمەکەی دایم لە ســـەردا »**
**« ئەمیان سەر کوتراو لە دەشت و دەردا !»**

**« سێ‌هەمیش هەیە بەڵام من نایڵـــێم »**
**« هەموو ئەیزانن لە بۆچی بیڵـــێم ؟! »**

شەرحی دوو شتەکەی بە کەری قەجەری و سنگ کردووە ، پاشان دوو شتی روو بەروو کردوونەتەوە و دەست نیشانی تێدایە؛ئەویان کە کەرەکەیە هەموو دەم رەشمەکەی بە سەرەوەیە • ئەمیشیان کە سنگەکەیە هەموو جار بە بەرد و مێکوت ئەدەن بە سەریا بۆ ئەوە بچێ بە ئەرزەکەدا • دەست نیشانەکەش ئەوەیە کە رەشمە بۆ کەرە ، نەوەکت بۆ سنگ ، ئەمیشیان سەرکوتان ، سەرکوتان بۆ کەر نی‌یە بەڵکوو لێرەدا هەر بۆ سنگەکەیە، سنگ رەشمەی بە سەرەوە ناکرێ بەڵکوو پێوە ئەبەسترێ •

دوور نی‌یە وا بچێتە دڵەوە کە ئەم وێنەیە بەر « پێچەو پەخشە » بکەوێ ، بەڵام لەبەر ئەم دەست‌نیشانە سەربەخۆیێک پەیدا ئەکا و ئەبێ بـە بابەتێکی سەر بەخۆ لە هونەرەکانی جوانکاری •

ئەوەنــــدە هەیە بە پێی رێزمان ئەبوایە ئاخری نیوە هۆنراوەی دووەم وشەی « سەختە » بوایە نەوەک « سەختا » ! •

ئەتوانین بڵێین « سەختە »ی کە کردووە بە « سەختا » لەبـــەر « ســـەروا » کەیە ، ئەم جۆرە شتانە بۆ هۆنەر ئەشێ و بـــۆ هۆنراو ئەگونجێ ، چـونکە ماوە دراوە بە هۆنەر کە دەســتکاری وشە بکا لـــە بـــەر رێ کەوتنی هۆنراو و سەرواکەی •

وه یا « پیرەمێرد » ئەڵێ :

« **دار و گیاو گیاندار پرر نشئەو دڵ خـــۆش** »

« **من و وەنەوشە مل کەچ و شــــین پـۆش** »

« **ئەو پابەنـدی خاک کۆنـــــە هـەواران** »

« **مـــن زیـمـوانـــی مـــەزاری یـــاران !** »

ئەم بەشـکردنـە دەستنیشانی تێدا هەیە ، چونکە هێمـــای «ئەو» لە ســــەرەتای یەکەم نیوە هۆنراوەی دووەما بــۆ « وەنەوشــــە » ئەگەرێتەوە ، « من » لە سەرەتای یەکەم نیوە هۆنراوەی دووەما ئــەو « من »ەیە کە لە پێشەوە وتوویەتی .

لە راستیدا جیاکردنەوەی « پێچەو پەخشە » لەگەڵ « بەشکردن»دا تۆزە بیرکردنەوە و ورد کردنەوەیەکی ئەوێ .



لەم بابەتی جوانـکارییەدا بەم جۆرە دوو جۆرە بـەشکردنیتـر هەیە کە نزیکن بەمەوە ، یەکێ ئەوەیە کە :

چەند سفەتێک بۆ شتێک دروست ئەکەی ، وە ئەو شتە هەر جارە نیسبەت ئەدەیتە لای یەکێ لـــەو سفەتانە بە جۆرێکی وا وەکوو چــۆن هەموویان لەگەڵیا ئەگونجێن ، یەکە یەکەش هەر بگونجێن ، وێنـــە وەکوو « حەمدی » ئەڵێ :

« **خوم و خزمم ئەسێنم حەق لەوانەی ناحەقن ئەمرۆ** »

« **چلۆن خزمن ؟ ؛ بە جەرگن ، شێری شەرزەن ، عارفـن ئەمرۆ** »

« **کە بانگیان کەم هەموو چوستن ، کە یەک بگرن گەلێ زۆرن** »

« **لە رووی دوشمەن ئەڵێی ئاسکن ، کە بێنە عدد کەمن ئەمرۆ** »

لێرەدا باسی خزمەکانی کردووە ، وە هەر جارە نیسبەتی داونەتە لای ســـفەتێک ، کە ئەو سفەتە لەو جارەدا بۆیان ئەگونجێ ، وەکوو چۆن خزمێکن ؟ ، بـــە جەرگن ، شێری توورەن ، تێ گەیشـتوون ،

ئەگەر بانگیان بـــکەم بۆ ئەوە بێن بە دەنگمەوە زوو رائـەپـەررن •
یەکێـکی‌تر لـە سفەتەکەیان ئەوەیە : کە پێـــکەوە یەک بـگرن زۆر زۆرن ، چونکە هـــەر یەکەیان لـــە جێگای چـــەند کەسێـکە •
سفەتێـکی‌تریان ئەوەیە : بەخێرایی وەکوو ئاسک چۆن خێرایە بـــەو جۆرە خێرایە روو بـــە رووی دوژمن ئەررۆن ، ســـڵ ناکەنـــەوە ، ئەگەر خۆ بە ژمارەش بیانژمێری ، زۆر نین ، کەمن ! •

دووەمیان ئـەوەیە کە رسـتەیەک بهێنرێتەو بۆ شتێک ، چی لـە ژێـر ئەو رسـتەیەدا بێ ، رستەکە هەموو بگرێتەوە • وەکوو ئەوە کە ئەڵێ :

**« ئەو تارماییە یا شێرە ، یا پلنگە ، یا هیچیان نی‌یە » •**

لێرەدا مادام تارتامایەکە هەبوو لەو سێ بەشە دەر ناچێ • وە یـا ئەڵـــێ : **« پیاوی فەقیر چی ئەبێ ؟ ناشوکری نەبێ ، یا کوڕی ئەبێ، یـا کچی ئەبێ ! »** • بەڵام ئەمە بەگاڵتەوە ئەڵێ « پیاوی فەقیر » ئەگینا فەقیر و دەوڵەمەند هەر وەکوو یەک وانە •

نوکتەیەکی‌تر کە هەر بۆ زمانی کوردی‌یە ؟ لەم زمانەدا مەبەست بە پیاو «انسان»ە انسان پیاو و ژن ئەگرێتەوە، کە وا بوو مەبەست بە«پیاو» لە مەسەلەکەدا «ژن»ە و لە سـەر شێوەی رەوانبێژی شتێکی لێ لابراوە ، واتە « ژنی پیاوی فەقیر » نوکتەکە بوو بە دوو ! •

تەماشـــا ئەکەی ئەم رستانە هـــەموو بەشەکانی بەشـــکردن گرتوونیەتەوە •



یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری گوزارەیی « کۆکردنـەوە لەگەڵ بڵاو کردنەوەدا ـ الجمع مع التفریق » ئەمەش ئەوەیە کە دوو شت بخرێنە ژێر خێوەتی یـــەک مەعناوە ، لە پاشا جیا بکرێنەوە لەو هۆیەدا کـــە یەکی خستوون • وێنە وەکوو « زێوەر » ئەڵێ :

**« دڵی زارم وەکوو ئاگر بە دایم کاری سووتانە »**
**« کەچی رووی یار وەکوو ئاگر هەموو دەم وا بە تابانە » .**

لێرەدا دڵی خـۆی و رووەتی یاری چواندوە بە ئاگر ، لە پاشا جیایانی کردۆتەوە بەوە کە ؛ لێکچوونەکە لە رووەتی یارا شەوق و بریسکەکەیە ، وە لە دڵی خۆیشیا کڵپە و بڵێسەکەیە ! .

وە یا « نالی » ئەڵێ :

**« مەکە لۆمەی پەشێوی دڵ کە ئەمشەو »**
**« پەشێواوە لـەبەر پەرچەم پەشێوان ! »**

هێناویە دڵی خۆی و پەرچەمی یاری خستۆتە ناو پەشـێواویەوە ، پاشـــان جیای ئەکاتەوە بەوە ئەڵێ‌ی لێکچوونەکەیان ئەوەیــە کە پەشێواویە کە لە دڵا نارەحەتی‌یە ، لە پەرچەما جوانی‌یە !



بەشێکی‌تر هەر لەم بابەتە لە جوانکاریی گوزارەیی « کۆکردنەوە » لەگەڵ بەشکردنا ـ الجمع مع التقسیم » .

ئەمەش ئەوەیە کە چەند شتێک لە ژێر حوکمێکا کۆ بکرێتەوە و پاشان بەشبکرێن . وێنـەکە وەکوو ئەوە : ساڵێـکی زۆر تووش بوو ، کابرایەکی کورد لێیان پرسی ئیمساڵ چۆن بوون ؟ . وتی :

**« چۆن بووین ! . لەو رۆژەوە کە زستان دەستی خۆی وەشان ، زێندە ماڵ و مەردەماڵ گولۆلەیان کەوتە لێژی ! مەرو ماڵات قڕی تێ کەوت . گزرەو پاوان خورا . گەورر و کادان چۆڵ بوو . دار و پەردوو سوتا ، گاو گۆتاڵ فەوتا ، چی ما ؟! . »**

لێرەدا چەند شتێکی بە دوو رستەی کورت کۆ کردۆتەوە ـ کە زیندەماڵ و مەردەماڵە ـ ؛ کۆی کردوونەتەوە لە ژێـر یـەک حوکمدا ـکە فەوتان و تیاچوونەـ پاشان ئەو تیاچوونە ـ کە حوکمەکەیە ـ بەشی کردووە و ئەڵێ : زیندەماڵ ـکە مەرر و ماڵات و گاو گۆتاڵە ـ فەوتان و

قوریان کرد بە هۆی بەفرو سەرمای ئەو زستانەوە ۰ مەردەمالّ ـ کە دار و پەردووە ـ هەر لەبەر ساردی زستانەکە هەمووی سووتێنرا ، کاو گرزرە ترا بە ماڵات هەر کەڵکی نەبوو ! ۰



ئەمجا پێچەوانەی ئەمەش هەر لە جوانکاری گوزارەییە‌یە ؛ واتە بەشکردنی چەند شتێک و لە پاشا لە ژێر یەک حوکمدا کۆ بکرێنەوە ۰ وێنە وەکوو ۰ شێخ رەزا ، ئەڵێ :

**« وەختی شەرر شێرن لە بۆ دوژمن ، لە سیلما شیری پاکن بۆ خۆیان »**

**« وا بووە عاداتی ئەجدادی گرامیان ، ماوەتە و بەم جۆرە بۆیان »**

باسی یەکێ لە عەشرەتەکانی کوردی کردووە ئەڵێ :

سفەتی ئەوانە لە کاتی شەررا وەکوو شێر وانە پەلاماری دوژمن ئەدەن هیچیان ناهێڵن ، لە کاتی ئاسایشیشا شیرێکی پاک و خاوێنن بـۆ خۆیـان ، واتـــە بە رەحم و بە هـاریکاری‌ـن بــۆ خۆیان ، ئـەم رەوشـــتە هەر لە باو و باپیریانەوە ماوەتەوەبۆیان ۰

یەکەمجار سفەتەکانی بەشکردووە کە ؛ ئازایەتیانە بەرانبەر بـــە دوژمن و بەزەیی و دڵپاکی‌یە بۆ خۆیان لە بەینی یەکا ، پاشان کـۆی کردوونەتەوە لە ژێر یەک حوکمدا ـ کە رەوشت و عادەتە ـ ؛ واتـــە ئەم رەوشتەیان هەر لە باو و باپیرەوە هەبووە ۰



لە هونەری جوانکاری گوزارەیی یەکێکیتر « **کۆکردنە و بلاو کردنەوە و دابەشکردنە ـ الجمع والتفریق والتقسیم** » ؛ **واتـــە کـــۆ** کردنەوەی دەستەیەک ، ئەمجا بلاو ئەکرێنەوە و پاشان دابەش ئەکرێن۰ وێنەکە وەکوو لەم پارچەیەدا هەیە :

۰ زستان درێژەی کێشا ۰ ئالیـک نـەما ، بەرخە جوانەکە لەبـــەر برسێتی خەوی لێکەوت ، لە خەویا وا :

**« بەهار هـات ، بەرغەل لە کۆز دەرچوو ، لەبەر برسێتی و خۆشیی هاتنی بەهـارەکە کەسیان ، کەسیان نادوێنن ، لە ناو ئـەو بەرغەلەدا هەندێکیان گەمەو یاری ئەکەن ، هەندێکیان لە بەر بێهێزی شلەپەتە بوون .**

**ئەوانەی گەمەیان ئەکرد کەوتنە ناو ئەو قەرسیل و سێپەڕەی بەهارەوە ، ژیانیان بوو بە ژیانێـکی شادمانی ، ئەوانەش کە بێهێز و لاواز بوون نەیانتوانی خۆیان بە بەهەشتی ئەو بەهارە شـاد بکەنەوە ، بە ناچاری قەساب هات و سەری بڕین، کەوتنە دۆزەخی بە تەواوی لـە ناو چوونەوە ! ئەمجا راچەنی چ لە ترسا ، چ لە خۆشیا ! »**

تەماشا ئەکەین بەرغەل لە کۆز دەرچوون ، بوون بـە دوو دەستەوە؛ دەستەیەکیان کەوتنە یاری ، دەستەیەکیان کەوتن ، ئەوانەیان کـە هێزیان تێدا هەبـوو کەوتنە ناو بەهەشتی ژیانەوە و مانەوە ، ئەوانەیان کە لاواز بوون کەوتنە بەر دەستی قەساب و چوونە دۆزەخی نەمانەوە !.

* * *

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری گوزارەیی « تەجرید ».. ئەم تەجریدە بەلای منەوە و لەم بابەتەدا بە « **رووتەوەکردن** » چاکتر دێت هەتا تەجرید .

دوور نی‌یە ئـەو رەخنەیە بگیرێ کە لە باسی « خواستن »دا « تەجرید » بە « رووت » **گوزارشتی لێی درایەوە ، بۆچ لێرەدا ئەبـێ « روتەوە کردن » بێ ؟ . خۆ بانێک نی‌یە و دوو هەوا ! .**

ئەڵێین ئەم تەجریدەی کە لێرەدا هەیە غەیری تەجریـدەکەی ئەوێیە ؛ ئەو لەوێدا رووت بوو لە هەموو شتێک ، بەڵام ئەمی ئێرە ــ وەکوو باسی ئەکەین ــ رووتی ئەکەینەوە لەو شتانەی کە هەیەتی ، ئەو بەرگەی لێی دائـەکەنین و بەرگێـکی‌تری ئەکەین بە بـەرا ، کـەوا بوو بۆ ئەم شوێنە « رووتەوە کردن » زیاتر جێگای خـۆی بوو تـا «رووت»؛ . ئـەتوانم بڵێم گوازرشـتی کوردی‌یەکە رەواتر بوو تـا

گوزارشتی عەرەبی‌یە کە ، کە لە هەر دوولا هەر بە « تەجـــرید » ناوی بردووە ! •

جا ئەم « **رووتەوەکرنە** »ش ئەوەیە کە :

شتێـــک هەیە سفەتێکی هـەیە ، تۆ لـــەو شتە مەوسووفە بـــەو سفەتەوە شتێکی‌تری لێ‌ی وەر ئەگرێ ، کە وەرگیراوەکەش • هـــەر وەکـــوو ئەو مەوسووف بە سفەتەوە ئەمیش سفەتێکی وەکوو سفەتەکەی ئەوی تێدا بێ • ئەم ئیشەش کە ئەیکەی بۆ هووشەکاري و موبالەغەیە •

ئەم « رووتکردنەوە »یە بەم ناساندنە ئەبێ بە چەند بەشێکەوە • بەشێکی ئەوەیە کە بەهـــــۆی « هۆ »یەکەوە بێ • وەکوو ئەوە کـە ئەڵێ :

• **من بەهۆی تۆوە دۆستێـــکی‌تری گیاني بە گیانیم هەیـــە** • •

ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە « تۆ » بەرانبەر بە من سفەتێـــکت هەیە کــە دۆستایەتیەکی گیاني بە گیانیتە لەگەڵ منا ، ئەوەندە ئەم سفەتەت توند و تیژە لەگەڵما ئەتوانم هەر بە هۆی تـــۆی مەوسوف بـــــەو سفەتەوە دۆستێکی‌تری وەکوو تۆم هەبێ :

بەشێکی‌تر لەم « رووتکردنەوە »یە ئەوەیە کە دێنی « لەوچوون ـ مشبەبە » و « لێ‌ی‌چوون ـ مشبە »ێک دروست ئەکەی ، بە تەواوی بۆنی لێ‌ی‌چوونەکە ئەنی بە لەوچوونەکەوە • بە وێنە وەکوو «حەریق» ئەڵـێ :

« **ئەگەر رووت نا لە شێخم تۆ لە بۆ نەو مەتلەبەت گیانا** »
« **ئەبێ وا بزانی پرست رووی لە بەحری قولزمە جانـــا** »

ئەمە موبالەغەیە لەشێخەکەیا ، کە پڕرە لە هەموو مەعنەویاتێک •

واتە : تۆ ، کە پرسیارت لەوە ، ئەبێ وا بزانی کە پرسیارەکەت رووی لـە دەریاری قولزمە • چونکە دەریای قـــولزم شەپۆل ئەدا ، ئەمیش وایـــــە ! •

ئەم جۆرە شتانە لە زمانی کوردیدا زۆرن . جا ، یــا بە کورتي ، یا بە درێژي . کابرا وەسفی مەلایەتی مەلایەک ئەکا ئەڵێ : « ماشەاللە پررە ، شەپۆل ئەدا » مەبەستی ئەو ئەوەیە کە زۆر عالمە . وەکوو بەحر شەپۆل ئەدا .

بەشێکیتر لەم بابەتی « رووتەوەکردنە » ، ئەوەیە کە شتێک هەیە مەوسووفە بە سفاتی گەلێ شتەوە . تۆ دێنی ئــەو سفەتانە ـ کە هــەر یەکە هی شتێکن ـ هەموویان ئەدەی بەو تاقە مەوسووفە ـ کە تــۆ ئەتەوێ ـ . لە دانــی ئەم هەموو سفەتانە بەو ، شتێکیتر دێتە ناوەوە کــە هەرگیز نابێ شــتی وا هەبێ ، بــەڵام تۆ مەوسووفێکی وا دروست ئەکەی لە نەبــوون ، بە مەرجێکیش مەوسووفەکەی تۆ ئەگەر رووتــی بکەیتەوە لەو هەموو سفەتانە ، خۆی شتێــکی زۆر بــێ نموود و اعتیادي دەر ئەچێ . وێنەی ئەمە وەکوو ئەو بررە هۆنراوە کە « نالی » بــــە سەرو گوێلاکی کەرەکەیا وتوویەتی . ئەڵێ :

**« من کەرێکم بوو . چ پەیکەر . تەی کەری هەورازو لێــژ .**
**« سینە پان و مووچە کورت و شانە بەرزو گوێ درێـــژ »**

**« بن زک و جەبهەت سپی . کلکت ئیسترو دامەن سیا »**
**. یەککە تازو سیپررو دوو بـاد و شـــەش دانگ و درێژ »**

**« کەللە وەک جەررەی شەرابی پررر نشات و تەرر دماغ »**
**« شێری نەرر ، ئاهتووی بەرر . گورگی سەفەر ، قەمچی نەچێژ .**

**« مل عەلەم . شیرین قەلەم ، ئاهوو شکەم . مەیموون قەدەم .**
**. سم خررو کلکت هەڵگر و مەنزل برر و عارەق نەرێـــژ .**

... ... ... ...
... ... ... ...

تەماشا ئەکەین لەم هۆنراوانەدا گەلێ وەسفی هێناوە ، کە هەر یەکە بەجیا هی مەوسووفێکە ، ئەم هەموویانی هێناوە داویە بە یەک مەوسووف

ـ که کەرەکەیەتـی ـ « دیارە کەرێکی وا هەر نی‌یەو نەبووە « ئەگەر
ئەم سفەتانەی لێی لابەری کەرێکی قورر بەسەری لاواز ئەمێنێتەوە ،
که کەرە ! « ئەمانەی که کردووە بۆ هۆشەکاري و موبالەغەیە •

بەشێکی‌تر لە « رووتکردنەوە » ئەوەیە که تۆ بێنی لە جێگایەکی
تایبەتی‌دا شوێنێـکی تایبەتی‌تر دروست بکەی و بیدەی بەو کەسەی که
ئەتەوێ « وەکوو ئەڵێ :

« **لە ناو سێ‌دەری کۆشکی ئازادی‌دا بە دڵنیایی دانیشتووە** »•
ئەماشا ئەکەین لە ناو ئەو کۆشکەدا ـ که کۆشکی ئازادی‌یە ـ
شوێنێـکی‌تری تەرخان کردووە • ئەمە بۆ زۆر هووشەکاری‌یە لـــە
ئازادي و کامەرانی ، مەعنای ئەوەیە که لە هیچ روویەکەوە ناتـــەواوي
نی‌یە ، وەکوو ئـــەوە وایە که تۆ بەشێـک لە کرۆکی شتێـــک وەر
بگری •

دیسان هەر بەشێـــکە لە « رووتکردنەوە »کە لە رێگای درەکەوە
بـــۆ مەبەستەکە بچێت « وەکوو لەم وێنەیەدا که « بێخود » ئەڵێ :

« **ئەی شۆخ و شەنگی سەراپەردەکەی جەماڵ** »
« **ئەی وەرگری کاسی مەلاحەت لە دەستی ئەهلی کەماڵ** »

« **نەیدیوە کەس لە تۆ زیاتر لەم دەیرە کۆنەدا** »
« **لابێ لە ئاوی دەستی بەخیل و ئاوابێ دەستی بەماڵ** »
تەماشا ئەکەین لەم وێنەدا ئەڵێ :

تۆ ئـــەو کەسەی که ئاوت لە دەستی چرووک وەر نەگرتووە ،
دەستی خۆت هەموو دەم ئاوەدانە بە ماڵ بۆ ئەوە بیدەی بە خەڵــک «
مەعنای وایە : ئاوی ، که لە دەستی چرووک وەر نەگرتبێ ، ئەبێ هەر
لە دەستی ئینسانی بەخشندەی وەرگرتبێ •

بەخشندەیەکی لە دۆستەکەی داتاشیوە و ئاوی بەخشـندەیی لـــە
دەستی ئەو کەســـی دووەمە وەرگرتووە « ئەمەشی که کردووە لـــە

رێگای درکەوەیە ؟ چونکە ئەو کە ئەوەی بۆ چەسپاند کە ئاوی لە دەستی چرووک وەر نەگرتووە ئەمەی بۆ ساغ کردەوە کە ئاوی لە دەستی بەخشندە وەرگرتووە ، ئەمەش ئاشکرایە کە لەو بەخشندەیە وەرگرتووە، کەوا بوو ئەو ئاو لێی وەرگیراوە بوو بە بەخشندەکە .

لێرەدا کەسێکی تر دروست بوو ـ جگە لە دۆستەکەی ـ بۆ موبالەغە . کە ورد بیشی ئەکەیتەوە هەر دوو کەسەکە دۆستەکەیەتی ؛ یەکێکی لە راستی ی دا هەر ئەوە ، یەکێکی تری ئەوەیە کە لەم رێگایەوە دایتاشیوە ! . وەکوو وترا ئەمە هەر بۆ هووشەکاری یە لە ناساندنی دۆستیا .

* * *

هەر لەم بەشی جوانکاری « رووتکردنەوە »یەدا یەکێکی تر ئەوەیە کە قسە لەگەڵ نەفسی خۆیا بکا ؛ واتە خۆی بکا بە یەکێک و لەگەڵیا دەست بکا بە ئاخاوتن . وێنەکەی وەکوو « سەلام » ئەڵێ :

« **دڵە ! کوورەی خەم کۆمەڵێ زووخاو سادەی خورۆشێ .**
**مووشە دەمەکەی هەناسەی پرتاو دەخیلە جۆشێ .**

ئەمە لێرەدا هەرچەندە وتوویە « دڵە » ، بەڵام ئەم دڵە دڵی خۆیەتی و قسەی لەگەڵ خۆی کردووە . وە یا هەر لەم وێنەیە یەکێکی تر ئەڵێ :

« **ئەگەر ئەتەوێ دڵت رەحەت بێ .**
« **نانت جۆیین بێ و خولقت گەنمین بێ »**

ئەمەش هەر قسەکردنە لەگەڵ نەفسی خۆیا .

* * *

بەشێکی تر لەم « رووتەوەکردن »ە ئەوەیە کە شتێک هەیە سفەتێکی خۆی هەیە ، تۆ دێنی ئەو سفەتە لەو وەر ئەگری و ئەیکەی بە سفەت بۆ شتێکی تر . وێنەی ئەمە وەکوو « **مفتی زەهاوی** » لە بارەی « مەلا عبداللەی جەلی زادە » وە وتوویە :

« کاکەواللە گوێ خێلە بۆ قسەکانی من ! » •

ئەمە لە مفتی‌یان پرسیوە کە مەلاعبداللە گوێ بۆ قسەکانی تـۆ رائەگرێ ؟ • ئەویش ئەو وەڵامەی داوەتەوە ! •

« خێل »ی شتێکە بۆ « چاو » ئەوترێ و سفەتی ئەوە و شتێک بـە دووشت ئەبینێ • ئەم سفەتە بۆ چاو وەنەبێ زۆر جوان بێ • کەچـی ئەو هاتووە ئەم سفەتەی داوە بە گوێ ، کە ئەوپەرری جوانی‌ی لێرەدا دەر ئەکەوێ • مەعنای وایە کە ئەو ئەوەندە بە ئارەزووە بۆ وەرگرتن و بیستنی قسەکانی من ، هەر قسـەیەکم کە کرد دەنگ ئەداتـــەوە لە گوێ‌دا و بیستنەکە ی بـۆی لە باتی یەکجار ئەبێ بە دووجار !•



یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاري گوزارەیی « **هووشە کاری** » یە• ئەم بابەتە لە بەلاغەی عەرەبی‌دا بە « مبالغة » ناو براوە •

ناساندنی ئەم بابەتەش ئەوەیە کە سفەتێک بۆ شتێـک بووترێ پێچەوانەی راستی‌ی بێ ، بەڵام ئەبێ نەختێـکیش بە رێ و جێ بێ ، لەوانە نەبێ کە بە تەواوی درۆ بێ • جا لەبەر ئەمە ئەبێ بە سێ بەشەوە ؛ یەکەم « تبلیـــغ » ، دووەم « اغراق » ، سێ‌یەم « غلوّ » • ئەمانە لـــە گوزارشتی عەربی‌دا وا ناو براون •

یەکەم ، کە « تبلیغ »ە • من لێرەدا ئەوەندە لە سەر ئەمانە ناڕۆم کە ئاشنایەتی‌یان بە چەمکەکانیانەوە چوونە • بەڵکوو هـەر لەســـەر وەرگێرراوی حەرفی ئەرڕۆم و ئەمەیان بە« راگەیاندن » ناو ئەبەم •

ئەم سێ‌یەش ئەگەر ئەو سفەتە بە ئەقڵ و بە عادەتی رێ ئەکەوت و ئەشیا ، ئەوە «راگەباندن»ە ، ئەگەر بە ئەقڵ ئەبوو بەڵام بە عادەت رێ نەئەکەوت ئەوە « اغراق »ە ـ کە من بە «رۆ چوون» ناوی ئەبەم ـ• ئەم

دووە بەلای ئەهــــلی بەلاغەوە ـ بە تایبەتی جوانکاري ـ وەر ئەگیرێن ،
ئەگەر خۆ نە بە عەقڵ و نە بە عادەت لەوانە نەبوون رێکەون ئەوە
« غلو » ە ، ـ کە من بە « لەرێ دەرچوون » ناوی ئەبەم ـ .

لێرەدا ئەبێ ئەوەش بزانین : مەبەست بەوە کە ئەو شتە ئەچێتــە
دڵەوە ، یا ناچێت . وە یــا عەقڵ و عادەت وەری ئەگرێ یا نایگرێ ،
ئەمە بەچاو زانیاري جوانکاري و اعتباراتی هۆنەرانەوەیە ، بەلای زانیاري
« رەوانکاري » یەوە هەموویان دروستن ، چونکە ئەم جۆرە شتانە بــە
لای رەوانکاريیەوە لە سەر مەعنای حەقیقی ناررۆن ، بەڵکوو لــە سەر
خوازە و درکە و خواستن و ئەو جۆرە شتانە ئەررۆن . کە ئەوانەی تێدا
هەبوو ئیتر هۆنراوەکە بچێتە ژێر خێوەتی عەقڵ و عادەتەوە ، یا نەچێ
زانیاري رەوانکاري هەر وەری ئەگرێ ، چونکە ئەو ئەو جۆرە شتانەی
ئەوێ . لە بەر ئەمە ئەلێ شت ئەبێ « جوانکاري » وەری ناگرێ ، کەچی
« رەوانکاري » باوەشی بۆ ئەگەرێتەوە .

ئەمجا بەشی یەکەم ـ کە « راگەیاندن » ە ـ . وەکوو ئەوە کــە
« شێخ‌رەزا » ئەلێ :

**« کەلە شێرێ بە رمزا لازمە کرماشاني »**

**« زیرەک و چابوک و دەم گەرم و دررو شەرراني »**

**« کەلەشێرێ کە قەپی گرت لە بناگوێ کەلەشێر »**

**« پرر بە دەم بیپچررێ وەک سەگی هەوراماني »**

بەلێ لێرەدا ئەم سفەتانە بۆ ئەو کەلەشێرە وتراوە لەوانەیە تۆزێ
دوور بن لە حەقیقەتەوە ، لەگەڵ ئەوەشا رێیان تێی ئەچێ ، چونــکە
ئەم وەسفانە هەموویان عەقڵ و عادەت وەریان ئەگرێ . لە نــاو کورددا
ئەو کەلەشێرانە کە شەررانین پێیان ئەلێن کەلەشێری کراماشاني . جا
ئەم جۆرە کەلەشــــێرانە کە بۆ شەررە کەلەشێـر رائەگیرێن راستە

زیرەکن ، خێران ، دەمیان گەرمە ، چونکە لە مەیدانەکەدا هاتو چۆی زۆر ئەکەن • راستە لەکاتی شەررە کەڵەشێرەکەدا ، کەڵەشێری ئـازا کە پەلامـاری کەڵەشێرێکی‌تر ئەدا ، بریندای ئەکا و گۆشـــتی لێی ئەکاتەوە ، تا وای لێی ئەکا ئەیبەزێنێ •

ددی ئەم جۆرە شتە هەم عەقڵیش وەری ئەگرێ ، هەم عادەتیش •

بەشی دووەم ـ کە « رۆچوون »ە ـ ، بە لای عەقڵەوە ئەگـونجا ، بـــەڵام بە رەوشت و عادەت کەمتر رووی ئەدا • وێنەی ئـەمە وەکوو « کوردی » ئەڵێ :

**« لە میوانخانەما ئیمشەو ئەگەر میوان نەبێ دەمرم »**

**« کە جەژنی من بە میوانە، خودا جەژنم بدە و نەمرم»**

**« ئەگەر ئەو هەر نەهات و من بە تەنها مامەوە لێرە »**

**« ئەوی نۆشی ئەکا گیانە ، ئەنێرم بۆی ، بمێنم یـــا وەکوو بمرم »**

ئەمە بەلای عەقڵەوە هیچی تێدا نی‌یە کە گیانی خۆی بۆ ئەو میوانە بنێرێ ؛ واتە لە دووری ئەو سوێ بێتەوە ، بەڵام ئەمە کەم رێ کەوتووە، بەڵکوو ئەم جۆرە شتانە هەموو ، وەیـا ئەم گوزارشـتانە لە هووشەکاری هۆنەرانە ! •

وە یـــا « حەمدی » ئەڵێ :

**« لە عەکسی دەستی رەنگینت دڵی پەیمانە رەنگینە »**

**« لە خۆشیی لێوەی شیرینت مەی و مەیخانە رەنگینە »**

**« کە ئەسراری دەمت بادی سەبا بۆ غونچەیی هێنـــا »**

**« فەرەح کەوتە دڵی ئێستا گوڵە و خەندانە رەنگینە »**

ئایا ئەمە وایە کە شەرابی ئاڵی ناو پەیمانە ئەو رەنگە شەرابیەی لە عەکسی خەنەی دەستی ساقیەوە وەر گرتووە ؟ • ئایـا ئەمە وایە کە ، لەبەر خۆشیی نۆشی ئـەو شەرابە ، ئەوان رەنگین بووبن ؟! •ئایـا

ئەمە راستـــە کە بای سەبا قسەی نهێنی مرواری ئامێزی ئەوی گەیاند بە غونچە و غونچـــە لە خۆشیا دەی کردەوە و دەســـــتی کرد بە پێکەنین ؟! •

بەڵێ ! عەقڵ دوور نی‌یە ئەمانە وەربگرێ • بەڵام هەرگیز عادەت وا نەبـــووە • ئەتوانم بڵێم ئەمە بەر « مستحیل » کەوتووە و لەوانەیە بەر بەشی سێیەم بکەوێ • هەر چەندە ئەتوانرێ بوترێ کە بەر بەشی سێیەم زیاتر ئەکەوێ بۆچ لێرەدا هێنرایەوە ؟ •

ئەڵێم بەر بەشی سێیەمیش ئەکەوێ ، ئەگینا ئەگەر زیاتـــر ورد بکرێتەوە لایەنی بەشی دووەمی زۆرترە تـا سێیەم • بەڵام بۆ باسی « جوانی بایس » پرزر بـە پێشتیە •

بەشی سێیە ـ کە « لـــە رێ دەرچوون » ە ـ ئـــەوەیە کـە ، نە بە عەقڵ و نە بە عادەت نەئەبوو • وێنەکەی وەکوو • حاجی قادری کۆیی » ئەڵێ :

**« کە هەستا قامەتی بەرزی ، لە فەرقی تـا وەکوو ئەرزی »**
**« بەرێشان زوڵفی سەد تەرزی ، بە یەکدا دارژا و لەرزی »**
**«حەیای چوو چەتری تاوس، بارەگاکەی شەعشەعەی رۆژیش»**
**« کەمەندی توهمتەن ، زنجیری داود ، گورزی گۆدەرزی »**
**« هەڵیدا زوڵفی چەوگانی گورەی خورشیدی دا بەر شەق »**
**« لەوێدا چەند مەلائک بوون سەمایان کرد لە سەر ئەرزی »**
**« دەقیقەیێک بێ سەری مووی لە زوڵفی وەر گەرێ دەردەم »**
**« لەگەڵ سوبحی قیامەتدا دەکا بێ تەقیە سەر بەرزی ! »**

تەماشا ئەکەی هووشەکاری وا نە عەقڵ و نـە عادەت و نە واقـــع هیچیان وەری ناگرن ! • ئەمە ئەبێ کە زوڵفی لە تەوقە سەریەوە تـــا کەلەمووستی پێی درێژ بێ و پەخش و بڵاو بێتەوە بە سەر لەش و لاریا ، بـــەڵام لە کوێ ئەمە ئەبێ کە کوورەی پرتاوی رۆژ و چەتری

هەزار ڕەنگەی کلکی تاوس لە بەر دیمەنی بڵاو بوونەوەی ئەو زوڵفە حەیایان بچێ ؟! .

سەرەرای ئەمەش کەمەندی توهمتەن و زنجری داودی پێغەمبەر و گورزی گۆدرزی پاڵەوان ئەوانیش هەر لە بەر ئەو زوڵفە خۆیان بشارنەوە !

سەیرتر لەمانە ئەڵێ کاتێ کە سەری با دا ، زوڵفەکانی کرد بە گۆچان و چوو ڕۆژی دایە بەر شەق !. چەند مەلایەکەیەک لەوێ دا بوون وەکوو هارووت و ماروت هێنایە خوارەوە ، لە سەر ئەرز دەستیان کرد بە سەما کردن ! . هەر تۆزێ سەری یەکێ لە مووەکانی سەری ، جیا بێتەوە لەوانیتر و هەڵبگەرێتەوە قیامەت بەر پا ئەبێ و لەگەڵیا ئەکەوێتە بەربەرەکانێ ! .

ئەمانە کە ئەم وتوونی ئایا وایە ؟. دیارەمەگەر هەر بەر ئەوە بکەوێ کە قسەیەک هەیە ئەڵێ : « لە هۆنەرانا ئەوی دروزنتربێ هۆنەرترە! ». وە یا ئەڵێ : « **تۆ جانەوەرێکی وایت ، تەنانەت ئەوانەش کە هێشتا ئەکەوتوونەتە سکی دایکیانەوە هەر لێت ئەترسن !** » .

لەگەڵ ئەمانەشا ئەم هووشەکارییە ، بە تایبەتی بەشی سێیەم ، هی وای هەیە تا ئەندازەیەک بەجێیە ؛ واتە شتی وا ئەخرێتە باڵی لەوانەیە بە هۆی ئەو شتەوە تۆزێ نزیک بێتەوە لە ڕاستیی . وەکوو ئەوە کە ئەڵێ : « **دارەکە لەبەر وشکی لەوانە بوو ئاگری تێ بەر بێ ، با ئاگریشت پێوە نەنایە** ». دار خۆی لە خۆیەوە ئاگر ناگرێ ، بەڵام وشەی « لەوانەیە » تۆزێ نزیکی خستۆتەوە لە ڕاستیی .

وە یا لەبەر جوانیی ئەندێشەکە ، گوێگر زیادە شەوقێکی بۆ پەیدا ئەبێ . وەکوو لە وەسفی « مایەن » یکا ئەڵێ : « **لەگەڵ مانگدا چەپۆکانێی ئەکرد** » . ئەمە هووشەکارییە بۆ غارکردنی پڕ تاوی ئەو مایەنە ، کە دەستەکانی لە وەختی غاردا ئەوەندە

زیاد بەرز ئەکاتـەوە ئەیانگەیەنێتە ئاسمان و لەگەڵ مانگ‌دا چـەپۆکان ئەکا ! دیارە ئەمە ئەو پەرری هووشە کاریەکی وایە نە عەقڵو نەعادەت هیچیان وەری ناگرن ، بەڵام لەبەر جوانیی وشەکانی و بێ خۆ شبوونی ، گوێگر بۆی ، تۆزێ نزیکی خستۆتەوە لە راستی .

وە یا رێ ئەکەوێ لە بەر نزیکی لە راستی و جوانیی خەیاڵەکە ، هووشەکارییەکە ئەخەنە قاڵبێکی شیرینترەوە . وەکوو ئەڵی :

**« بە ئەستێرەی شەو ئاسمانی تاریک بزمار رێـــژ کرا »**

**« برژانگی چاوی منیش بەوانەوە توند شـــەتەک درا ! »**

ئەمە دەردە دڵ لەوە ئەکا کە پەزارە نەیهێشتووە بخەوێ ، کـــە نەنووستووە شەوەکە هەر زۆر درێژ بوەتەوە و رۆژ نەبوەتەوە . ئەویش بەو هۆنراوە وتوویە :

ئەو شـــەوە هەر رۆژ نەدەبووەوە ، چونکە وای لێ‌ی هاتبـــوو ئەستێرەکان وەکوو بزمـار کوترابوون بە ناو تاریـکی شەوەکـەدا ، جووڵەیان نەئەکرد، برژانگی چاوی منیش بەسـترابوو بەو ئەستێرانەوە، پێڵوەکانم نەئەنیشتنە سەر یەک تـا خەوم لێ‌ی بکەوێ ! .

ئەستێرە بوو بێت بە بزمار و کوترابێت بە ئاســـمانا و براژنگیش بەسترابێ بـــەو ئەستێرانەوە . ئەمە نە عەقڵ قبووڵی ئەکا و نە شـــتی واش هەبووە ، بەڵام جـوانیی خەیاڵەکە تۆزێ نزیکی ئەخاتەوە لـــە راستیی .

وە یـــا هەر لە « رێ‌دەرچوون »ێکی مەقبوولە هەندێ لەو شتانە کە بۆ گاڵتـــەو گەپ و رابواردن ئەوترێ . وەکوو ئەوە کابـرا ئەڵێ :

**« هەر لە دوێنێ‌وە سەرخۆش ئەبووم ، ئەگەر ئێستە بیر لەوە بکەمەوە ، سبەینێ عەرەق ئەخۆمەوە ! » .**

دیارە ئەمە هەمووی هوشەکارییەکی وایە نە عەقڵ قبووڵی ئەکا ،

وه نه شـــتی واش روو ئەدا ، بەڵام پێکەنین و گاڵتەیەک بە هـــۆی عبارەتەکەوە دێتە ناوەوە نزیکی ئەخاتەوە لە راستیی •



یەکێکیتر لە هونەری جوانکاري گوزارەیی « ریبـــازی ئەهلی کەلام »ە • واتە لە سەر رێبازی ئەو دەستەیە کە قسە لە زاتی خـــواو سفەتەکانی خواوە ئەکەن • ئەمەش ئەوەیە کە تۆ داوای شتێک ئەکەی، بەرەنگارت ئەبن ئەڵێن وا نییە • تۆیش بەڵگەی بۆ دێنیتەوە بـۆ ئەوە باوەررەکەی خۆت بچەسپێنیت •

وێنەی ئەمە وەکوو لە کابرایەکی کوردیان پرسی خوا چەندە ؟• وتی : هەر یەکێکە • وتیان بەچی دا ئەیزانی ؟ • وتی : بە ئاشـەکەی ماڵی لالەما • وتیان : چۆن ؟ • وتی :

**« ئاشـەکەی لالەم تا هەر هی خۆی بوو ، باش ئەگەررا ، لـەو رۆژەوە بوو بـە شەریک لەگەڵ حـەمەی میروەیس‌دا ئیتـر پەکی کەوت ! ئەم دنیایـەش ئەگەر خوا • یکێکیتری لەگەڵ بوایە هـەر لە زووەوە ئەم دام و دەزگایە تێک ئەچوو ! » •**

تەماشا ئـەکەین کابرا بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ چەسپاندنی قسـەکەی خۆی ـ کە یـەک بوونی خوایە ـ لە سەر ئەو رێگایە کە زانایانـی زانیـاري • کلام و الهیات • بەڵگە دێننەوە بۆ چەسپاندنـی بیرو باوەرری خۆیان • لەگەڵ ئەوەشا ئەم کابرا کوردە وەنەبێ ئاگای لە بەزمی کەلام و لەو زانیـاري‌یە هەبێ ، بەڵام چەشەی سـادەی خـۆی وای لێ‌ی کردووە کە ئەو وێنەیە بێنیتەوە بۆ بتەوکردنی مەبەستەکەی خۆی •



هونەرێکیتر لە جوانکاري « **لێ‌ی‌کردنەوە** »یە • زانایانی بەلاغەی عەرەبی بە « تفریع » ناوی ئەبەن •

ئەمەش ئەوەیە کە تۆ حوکمێک بۆ شتێک دائەنی ، لەو حوکمە حوکمێکی‌تری لێ‌ی ئەکەیتەوە و ئەیدەی بە شتێکی‌تر • وەکوو ئەمە هەیە ئەوەش هەر لەم بابەتەیە کە حوکمێک ئەدەی بە شتێک ، لە پاشا حوکمێکی‌تری لێ‌ی ئەکەیتەوە و ئەیدەی بە شتێکی‌تر •

وێنە بۆ یەکەم وەکوو « بێخود » ئەڵێ :

« **خوا بارانی هێنا ئەرزی تێراو کرد** »

« **وەکوو ئاشی « ولووبە »ی هەم ئاوەدان کرد** »

لێرەدا حوکمەکە بارانەکەیە کە داویە بە شتێک وەکوو تێراوکردنی ئەرزەکە بێ ، ئەجا ئەم بارانە کە ئیشەکەی ئەوە بووە ئەرزەکەی پاراو کردۆتەوە ، ئەوەشی هەرکردووە کە ئاشەکەی « ولووبە »شی خستۆتە گەرر • ئەم حوکمەی دوایی لەوەی پێشوو بوەتەوە •

« ولووبە » دێ‌یەک بووە لە بناری شاری سولەیمانی •

وێنە بۆ دووەمیش وەکوو « فانی » ئەڵێ :

« **کە ئەمدوێنی بە زاری غونچە ئامێزت ، هەمووی شەکرە لە بۆ زارم** »

« **وەکوو پاکی‌ی دڵت ئاوێنەیەکی سافە بۆ جسمی رەحەتبارم**»

لێرەدا هۆنەر وەسفی دۆستی کردووە • ئەڵێ : کە قسەم لەگەڵ ئەکەی ، قسەکانت وەکوو شەکر وایە بۆم ، دڵیشت لەگەڵما پاکە ، وەکوو ئاوێنەیەکی ساف وایە هیچ خەوشێکی بە سەرەوە نی‌یە • واتە دڵ و زمانت لەگەڵما پاکە •

حوکمێک ـ کە زمانپاکیەکەیەتی لەگەڵیا ـ بۆی ساغ کردۆتەوە ، ئەمجا لەمەوە لقێکی‌تری لێ‌ی کردۆتەوە ئەڵێ دڵیشت بەو جۆرە لەگەڵما پاکە •



یەکێکی‌تر لـە هونەری جوانکاري گوزارەیی « **جـەختی وەسپ بە وەکوو خوسب** » بەلاغەی عەرەبي بە « **تأکید المدح بما یشبه الذم** » ناوی ئەبا ، منیش لە روانینێژي کوردي‌دا بەو ناوەوە داناوە ،

ئەم هونەرەش دوو جۆرە ؛ جۆرێکیان ـ کە ئەمەیان رەنگینێ چاکتر بێ ـ ئەوەیە کە سفەتێـکی خوسپ لە شتێکا نی‌یە ، لەمە وەسپێک جیا بکەیتەوە بـۆ ئەو شتە ، گوایە وای دابنـــێ کە ئەم وەسپە لـە نـاو خوسبەکەدایە ، وێنە وەکوو « شێخ‌رەزا » ئەڵێ :

**« لە سەخاو و لە کەرەم دا ، لە فەساحەت لە ئـەدەب دا ،**
**« یەکە بازە لە سەفەردا ، یەکە تازە لە « حضـــر » دا »**
**« تاقــــە عەیبی کە هــەبێ هەر ئەوەیە تاقـە کەســــە ،**
**« لە هەموو خاکی عەرەب‌دا و لە هەموو شاری عەجــەم‌دا ،**

ســـەیر ئەکەین هێناویە وەسفی ئـەو دۆستەی خۆی کردوە بەو هەموو وەســفانە کە کردوویەتی ، ئەمجا هاتووە جەختی کردۆتــەوە بە شتێک کە لە شێوەی « استثنا »دایە ، ئەم جیاکردنەوەش وا لە پیـاو ئەکا کە خوسپە، کەچی واش نی‌یە ، بەڵکوو جەختی وەســپەکەیە و وەسپەکەی زیاتر چەسپاندوە ، چونکە ئەڵێ :

لە هەموو وڵاتان‌دا ئەو یەکەم کەسێـکە کە ئەو هەموو سفەتانەی تێدا بێ ، یەعنی ئەم تاقە کەسەی بۆ ئەو هەموو سفەتە چاکانەی لێ‌ی کردووە بە عەیب ! دیارە عەیب بوونی ئەم سفەتانەش مەحاڵە ، چونکە ئەم سفەتانە زیاتر پایەی مەوسووفەکە بەرز ئەکەنەوە ،

چەسپاندنی ئەم جـۆرە شتانەش لە مەعنادا وەکوو ئەوە وایە کە تۆ شتێـک بەستی بە مەحاڵەوە ، شتێکیش کە بەند کرا بە مەحاڵەوە ، خۆی بـــە مەحاڵ دەرئەچێ ! ، بەڵکوو لێرەدا وای لێ‌ی دێتـــەوە کە تۆ داوای شتێـک بـکەی بە بەڵگەوە ؛ چونکە پێچەوانەی داواکـــەی

بەستووە بە مەحاڵەوە ، شتێکیش کە بەسترابێ بە مەحاڵەوە ، بە مەحاڵ دەرئەچێ .

کەواتە نەبوونی عەیبەکە شتێکی زۆر دیارییە و ئەو سفەتانە هەموو لەودا هەن بە بێ گیرو گرفتی .

جورەکەی‌تر ئەوەیە کە سفەتێکی مەدح بۆ شتێک دابنێ ، پاشان شتێکی وەکوو « استثنا » بێنێتەوە ، پاش ئەو سفەتێکی مەدحی‌تر بۆ شتەکە دابنێ . وێنەی ئەمەش دیسان هەر وەکوو «شێخ‌رەزا» ئەڵێ :

**« صەلاح الدین کە ئیسلامی گەیاندە پایەی ئەفلاک »**

**« ئەمە وابوو، ئەوند بوو، ئەو لە زومرەی کوردی خۆمان بوو»**

تەماشا ئەکەی سفەتێک ـ کە بەرزکردنەوەی ئیسلامە ـ داویە بە صەلاح‌الدین ، پاشان وشەیەکی داناوە کە « ئەوەند بوو »یە ، ئەمە وەکوو « استثنا »وایە ، پاش ئەو سفەتە مەدحێکی‌تری داوەتێ ، کە ئەڵێ ئەو پیاوە لە نەتەوەی کورد بوو .

ئەم جۆرەیان لە هەموو شتێکا وەکوو یەکەمەکە وایە ، ئەوەندە هەیە لێرەدا سفەتە خوسپەکە نییە تا وەسپەکەی لێی دەرکەی بۆ مەوسووفەکە ، یا بۆ مەمدووحەکە .



بەشێکی‌تر لەم بابەتە **«جەختی خوسپە بە وەکوو وەسپ»** گوزارشتی عەرەبی ئەڵێ « تأكيد الذم بما يشبه المدح » .

ئەمیش دیسان دوو بەشە ؛ بەشی یەکەم ئەوەیە کە سفەتێکی مەدح لە شتێکا نییە ، لەمە زەمێکی لێ دەرێنی بۆ ئەو شتە ، گوایە وای دا بنێ کە ئەم خوسپە لە ناووەسپەکەدایە . وەکوو ئەوە کە ئەڵێ :

**« فلان کەس هیچ باشیەکی نییە تەنیا ئەوە نەبێ کە خرابە ئەکا لەگەڵ ئەوکەسەدا کە چاکەی لەگەڵ ئەکا ! » .**

بەشی دووەم ئەوەیە کە سفەتێکی زەم بۆ شتێک دابنێ ، پاشان شتێکی وەکوو «استثناء» بێنیتەوە ، پاش ئەو سفەتێکی زەمی‌تر بۆ شتەکە دابنێ. وەکوو ئەڵێ : « **فلان کەس بەد کردەوەیە ، ئەوەندە هەیە نەزانە !** » .
شەرحی ئەم دووەش هەر وەکوو دووەکەی پێشوو وایە .



بەلای منەوە یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری گوزارەیی ئەو بابەتەیە کە من بە « دوولانە »ی ناو ئەبەم . ئەمەش خوسپ و وەسپێکە کە هۆنەر وەسفی دۆستێکی ئەکا ؛ دێنێ نیوە هۆنراوەی یەکەم بە جۆرێک دائەرڕێژێ کە پڕیەتی لە خوسپ و بەجۆرێک دێتە بەرچاو کە هەمووی جنێوو ناشیرینیە . کە نیوەی دووەمی بە نموێنا دێت سەیر ئەکەی وەکوو ئاشکرایێک وایە بۆ نیوەی یەکەم و نیوە یەکەمەکە بە وەسپ ـ مەدح دەر ئەچێ . وێنەی ئەمە وەکوو «مەلاغەفوور»ی حافزی سابلاخی ئەڵێ :

**« تا بژیم تێت ئەبرم خاوەنی جوانی و دەسەلاتە : »**
**«چاوی ئاوات و هیوا، ئەی گوڵی سەر تۆپی وڵات»**
**« دا دەمرکێ کوڵی دڵ تاوێکی لێی خەم ـ دەبێ : »**
**« بە سەری نووکی زمانم لە سەری پەنجەی پات »**
**« ڕۆژی هەڵکەوتە دەسابێ دڵەکەم تێت ڕاکەم :»**
**« بە ترومبێلی فیداکاری بەرەو کۆرری خەبات »**
**« یاری شیرین ــ وەرە . تا زووە لێت نەچووە: »**
**« تەمەنی جوانی بژین پێکەوە ، تاکەی بە تەمات ؟ ».**

من ئەم جۆرە بابەتە بە شتێکی سەر بەخۆی ئەزانم ؛ جەختی خوسپ نی‌یە بە وەسپ ، چونکە سفەتی خوسپ لە نیوە هۆنراوەی پێشوودا وەنەبێ هەبێ تا تۆ وەسپی لێی وەربگری ، بەڵکوو سفەتە خوسپەکە زەق دیارە و هەیە . دیارە جەختی وەسپیش نی‌یە بە وەکوو

خوسپ » گەررانەوەش نی‌یە، چونکە نوکتەی تێدا نی‌یە » کەوا بــوو شتێــکی سەر بەخۆیە ؟ » خوسپ و وەسپ » ، یــا » دوولانە » »



یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری » **رەدوو** » · بەلاغەی عەرەبی بە » **استتباع** » ناوی ئەبا ·

ئەمەش ئەوەیە کە تۆ مەتحی شتێك بکەی بە جۆرێ کە لەمەوە مەتحێــکی تر بۆ شتەکە پەیدا ببێ » وەکوو » پیرەمێرد » ئەڵێ :

**» هێندەت لە عومری جوانان هێنـــاوە »**

**« گۆی بکــەیتـــەوە و بینێ بـــەم لاوە »**

**« لە سەر عومری خۆت دایبنێ سەر جەم »**

**» دنیا پێت ئەڵێ پیرۆزە و بێ غــــەم »**

ئەمــــــەی بە » نالە پێ پانا » وتووە ، گوایە مەتحی کردووە بــە ئازایەتی » « نالە » بۆ خەڵک کوشتن بە ناوبانگ بووە » پیاوی وا مەتح هەڵناگرێ ، بەڵام هۆنەر هەر ئازایەتیەکەی مەبەست بووە » وتوویە :

ئەگەر ئەو هەموو عومرەی ئەوان بێنــی و بیخەیتە سەر عومــری خـــۆت ، ئەوەندە عومرت زۆر ئــەبێ هەر نەبێتەوە » ئەم دنیایە پێت ئەڵێ : پیرۆزت بێ ئەم عومرە درێژە ، بـــۆ خۆت بــە ئاسوودەیــی دانیشە »

لێرەدا مەتحــی » نالە »ی کردووە بە ئازایەتی ، لەم مەتحـــەوە مەتحێــکی‌تری بــۆ پەیــدا بووە کە دنیا پێی وتووە بــە ئاسودەیـــی دانیشــــە ، چونکە تــۆ پیاوخراپان ناهێڵێت و ئەبیت بــە هۆی چــاکی دنیـــــا !»



یەکێــکی‌تر لەهونەری جوانکاری « **دوورووو** » ـ کە ئەمە لـــە بەلاغەی عەرەبی‌دا بە « توجیە » ناو ئەبرێ ـ »

ئەمەش ئەوەیـــە کە شتێـک بڵێت دوو رووی هـەبێ ، وەکوو ئەوە لە بارەی پیاوێـــکی یەکچاوەوە ئەڵێ : « **بریا هەر دوو چـــاوی وەکوو یـەك وابوونایە** » ئەگونجێ دوعای چاکەی بۆ بکا و مەبەستی ئەوە بێ هەردوو چاوی‌ساغ بوونایە ، وە ئەگونجێ دوعای شـــەرری لێ بـــکا ، مەبەستی ئەوە بێ کە هەر دوو چاوی کوێر بوونایـــە ! ئەکرێ بە « یەك لە دوو »یش ناو ببرێ .



یەکێکی‌تر لە هونەرەکان « **چوونە ناو یەك** » ، واتە « **ادماج** » ئەمەش ئەوەیە ئەو رستەیە کە بۆ مەعنایەك دانراوە مەعنایەکی‌تریش بخاتە ئەستۆی خۆی ، وەکوو « شێخ‌رەزا » ئەڵێ لەم رووەوە :

« **با جەردە بیبـا کەوڵەکـــــەی ناجی** »
« **بەهار هات جلی پێنـــاوێ تاجـی** »

ئەوە هۆنراوەی پێشوو مەعنایەکی‌تری گرتۆتە خۆی کە نیـــوە هۆنراوەی دواییەیە .

ئەم « چوونە ناو یەك »ە بۆ خوسپیش ئەبێ و بۆ وەسپیش .



یەکێـکی‌تر لە هونـەری جوانکاری « **گاڵتەو گەپ** » . ئەمـــە لەرواڵەتا گاڵتە و گەپە ، بەڵام لە راستی‌یدا مەبەستی شتێکی راســـتە . لـــە بـەلاغەی عەرەبی‌دا بــــە « الهزل الذي يراد بــه الجد » ناو ئەبرێ .

وێنە بۆ ئەمە وەکوو « قانع » ئەڵێ لە کاتێـکا کە کەرێـک بانگ کراوە بۆ سەر شایی :

« **جارێ کەرێکیان بانگ کرد بۆ شـــادی**
« **قـا ، قا پێکەنی ، کەر بـــــە ئازادی** »
« **کلکی بەرزۆ کرد ، لووتی هەڵبـــری** »
« **بە دڵێکی خۆش جار جار ئەزەرری !** »



یەکێکی‌تر لە جوانکاری گوزارەیی « **خۆ گێل کردن** » . ئەم چەمکە لە گوزارشتی عەرەبی دا پێی ئەڵێن « تجاهل العارف » . لام وایە خۆ گێل کردن چەمکەکە زیاتر ئەدا بە دەستەوە . ئەمەش ئەبێ بە چەند بەشێکەوە . بەشێکیان ئەوەیە کە :

شتێک هەیە ئەیزانێ بەڵام خۆی لێی گێل ئەکا !. ئەم خۆ گێل کردنەش یا لە بەر ئاه و دەرێکە کە دڵی بەو مەبەستەوە بەندە و لەبەر دڵبرینداری نایەوێ ناوی بێنێ ، وە یا لە بەر رێ گومکێ ئەم ئیشە ئەکا .

وێنەی ئەمە وەکوو « محەمەد ئەمین خدر » ـ کە پشت ماڵەیەکی جاف بووە و ـ قسە لەگەڵ شارەزوور ئەکا و ئەڵێ :

**« وتم شارەزوور ! چیت لێ قەوماوە ؟ »**
**« کێ تۆی کردووە بە بەحـرو ئاوە ؟ »**
**« بۆم بگێڕەوە سەرانسەر ئەحوال »**
**« لە داخت دڵم بوو بە کۆی زوخـال »**
**« گەلی « پاشارێ » تا سەر سوورە جو »**
**« تیایا ئەوەزی کۆمـاران کۆ . کۆ »**
**« کوا ؟ دوانزە هەزار عێلی کوردەوار »**
**« گشت بە سەر تۆدا ئەیکرد راگوزار »**
**« کوا ؟ دوانزە هەسوون ماڵە میرانت »**
**« کوا ؟ سەدای تەپڵی سەر کۆمارانت ! »**

بەشێکی‌تر لەم خۆ گێل کردنە هوونەکاریەکی زیاد لە ئەندازەیە.

وێنەی ئەمە وەکوو « سالم »ی سنە لە وەسفی دۆستیا لە کاتێکا کە پێکەنیوە ئەڵێ :

**« ئەو زەردە خەنە غونچە بوو پشکووت ؟ »**
**« بۆن و رووناکی کەوتە دەم و رووت »**
**« یا خۆ ئاسمان بوو چەخماخەی لێ دا ؟»**
**« عالەم بە جارێ بوو مات و مەبهووت »**

وه یا هووشه‌کاري له خوسپ‌دا « وه‌کوو « شێخ‌ره‌زا » ئه‌ڵێ :

**« چه‌رمی رووی هێند قایمه شمشێری میسری نایبڕێ »**
**« گه‌ر به که‌وشی که‌ی دمێنێ تا قیامه‌ت نادڕێ ! »**

وه یا له سه‌رسامي له خۆشویستن دا ـ « التدلُّه في الحب » ـ مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه ئه‌وه‌نده خۆشي ئه‌وێ ، خۆی تێ‌دا ون کردووه و خۆی ئه‌کا به نه‌شاره‌زا ! «

وێنه‌یه‌ک له‌م بابه‌ته وه‌کوو « نووحی » ئه‌ڵێ :

**« کۆتره‌کانی چۆل به له‌نجه وه‌ک یار »**
**« پۆل پۆل وه‌ستاون ، دوورن له ئه‌غیار »**
**« نازداره‌که‌ی من که‌وتۆته ناوتان »**
**« کۆتر ، ئینسانه ! ئێوه و خواتان ! » »**

لێره‌دا له‌به‌ر زۆر دڵبه‌ند بوون به یاره‌وه ، خۆی گێل ئه‌کاو ئه‌ڵێ : کۆتره‌کان ! ئه‌و نازداره‌ی من که که‌وتۆته ناوتان ، سوێندتان ئه‌ده‌م به خوا ئه‌وه له ئێوه‌یه ؟ یا ئینسانه ! «

* * *

یه‌کێکی‌تر له جوانکاري گوزاره‌یی « **دان به پێویست** » ٠ به‌لاغه‌ی عه‌ره‌بی بۆ ئه‌م چه‌مکه « **القول بالموجب** »ی بۆ داناوه ٠ من له ره‌وانبێژي کوردی‌دا به‌و ناوه‌وه ناوم بردووه « مه‌به‌ست له‌م چه‌مکه‌ش ئه‌وه‌یه که :

که‌سی یه‌که‌م هه‌یه « واته « متکلم » ، که‌سی دووه‌م هه‌یه ، واته « مخاطب » ، که‌سی دووه‌م شتێک ئه‌ڵێ و ئه‌و شته به « ته‌وزیم ـ واجب » ئه‌زانێ « که‌سی یه‌که‌م دان به‌و ته‌وزیمه‌دا بنێ « واته « **اعتراف** »ی پێ‌ی بکا ٠

ئه‌مه‌ش دوو جۆره ؛ جۆرێکیان ئه‌وه‌یه :

سفه‌تێک که له قسه‌ی غه‌یردایه درکه بێ له شتێک که حوکمێک چه‌سپاندوویه بۆ ئه‌و شته « تۆ دێنی ئه‌و سفه‌ته له قسه‌ی خۆتا دائه‌نێ

بۆ غەیری ئەو شتە ، ئیتر بێ ئەوە خۆت لەوە بکەیەنی کە حوکمەکە بدەی بە غەیرەکە یا نەیدەی ۰

وەکوو ئەوە کە لە وەختی خۆیا « **خلەپەزە**»ی هەمەوەنـــد ناکۆکی هەبوو لەگەڵ « حەمە پاشای ، جاف و جافەکانا ۰ دەســـتەی حەمەپاشا لەو دەشتی گەرمیانە بوون ۰ دەستەی خلە پەزەش چووبوون بۆ ئەوبەری « سیروان »۰ ئەمجا خلەپەزە وتبووی :

« **شەرتە ئەگەر چووینەوە ئەوانەی کە بە ســـەربەرزی لـەوێدا دانیشتون بە سەر شۆرری دەریان کەین !** »۰

**حەمە پاشا وتبووی : « ئەمە قسەیە ! ۰ سەر بـەرزی هەر بـــۆ ئێمـــــەیە »** ۰

لە عیارەتی پێشوودا سفەتێک هەیە کە « سەربەرزی »یەکەیـــە ، کەوتۆتە ناو قسەکەی خلە پەزەوە ۰ ئەم سفەتە « درکە »یە لە شتێک ـ کە دەستەی حەمە پاشایە ـ حوکمێک دانی ناوە بەو شتەدا حوکمەکە دەرکردنی دەستەی حەمە پاشایە لە گەرمیان ۰

ئەمجا حەمەپاشا هاتووە سفەتەکە ـ کە سەر بەرزی‌یە کەیە ، داویە بە بەرەی خۆی ، ئیتر بەلای ئەوەدا نەچـــــووە حوکمـــــەکە ـ کە دەرکردنەکەیە ـ بیدا بە بەرەی خلەپەزە ، یا نەیدا ! ۰

جۆری دووەم ئەوەیە کە وشەیەک لە رستەی یەکێـکی‌ترا هەیە ـ واتە کەسی دووەم « مخاطب » ـ بیبرری بە سەر ئەو مەعنایەدا کە کەسی یەکەم « متکلم »۰کە مەبەستیەتی ۰ بەڵام ئەبێ کاتێ کە کەسی دووەمەکە وەڵامی کەسی یەکەمەکە ئەداتەوە وشەکەی ئەو ببررێ بـە سەر غەیری ئەو مەعنایەدا کە مەبەستی بووە ، ئەبێ شتێـک لە رستەکەی ئەم دا هەبێ کە پەیوەندی بە وشەکەوە هەبێ ۰

وێنەی ئەمە وەکوو « محەمەد رەمزی » ئەڵێ :

**« من بێمە لاتان بارگرانیـــکم بە ســـەرتانەو »**

**« وتی بارت گرانە بەو دیاریەی وا بە سەرمانەو »**

وشەی « بارگران » کە لە رستەی کەسی یەکەمدایە مەبەستـــی ئەرک و زەحمەتە بە سەریانەوە ، ئەویتر وشەکە ئەبرێ بە ســـەر بارگرانی بۆیان بـە هـــۆی دیاری‌یەکەوە کە لەگەڵ خۆی بردوویـە بۆیـــان ۔

وشەی « دیاری » پەیوەندی هەیە لەگەڵ بارگرانی‌دا ! ۔



بەلای هەندێ لە زانایانی بەلاغەوە « هووشە لە وەسپا ـ الاطراء » دیسان لە جوانکاری گوزارەیی‌یە ۔

ئەمەش ئەوەیە کە تۆ ناوی مەمدووحەکە بێنی لەگەڵ نـــاوی باو باپیریا ، وێنە وەکوو « عدلی‌کەمال باپیر » لە وەسپی یەکی لە خانەدانەکانا ئەڵێ :

**« وا مەزانە نیعمەت و فەزڵت لە سەر ئێمە هەمووبۆ تۆ بووە »**

**« باوکت و باپیرتو باپیری باوکت وا بووە ! »**



# جوانکاري وشەیی

ئەوە بوو بابەتی جوانکاري بوو بە دوو بەشەوە ؟ جوانکاریەک ، کە روو لە گوزارە ئەکاتەوە ، ئەوەیان باسکرا . جوانکاریەک کە روو لە وشە ئەکاتەوە ؟ واتە بە هۆی وشەکەوە هونەری جوانکاریەکە دروست ئەبێ ، وە ئەوەش وترا کە بۆیە گوزارەیەکە پێش‌خرا چونکە گوزارە لە پێش وشەدایە ، وشە قاڵبە بۆ گوزارە . ئیستە دێنە سەر باسی وشەییەکە .

جا یەکێـک لەوانە

## ڕەگەزدۆزي .

رەگـەز دۆزي ، کـە « جنـاس » لـە عەرەبی‌دا « بۆیەش کوردی‌یەکە وای بۆ داناوە چونکە « رەگەز » بە مەعنا ئەسڵ و نەژادە « « دۆزي » لە دۆزینەوەوە هاتووە . وای‌لێ‌ی دێتەوە کە پێـکەوە گونجان و دۆستایەتی رەگەزي دوو وشە پێکەوە ئەدۆزیتەوە و پەیدای ئەکەی .

بێ‌گومان ئەبێ لە وشەیەک زیاتر هەبێ لە رستەکەدا ئەو وەختە گونجاندن دروست ئەبێ . ئەم گونجاندنەش روو لە وشـە ئەکاتـەوە نەوەک گوزارە . ئـەوەی کە بۆ گوزارە بوو لە باری گوزارەوە قسەی لێوە کرا . ئەوەش کە بۆ وشەیە ئەبێ لە باری وشەوە قسە لێوە بکرێ . جا بەو بۆنەوە ئەچینە جەرگەی باسەکەوە و ئەڵێین :

یەکێکی فراوان لە هونەری جوانـکاري وشـەیی « رەگـەز

دۆزي »یە • ئەمەش ناوە بۆ رستەیەک ـ هۆنراو بێ یا پەخشان ـ کە دوو وشـە ، وە یـازیاتری تێدا هەبێ • وشەکان لە رواڵەت و روخسار دا لە یەک بچن ، واتـە وەکوو یـەک وابن • چونـکە ئەگەر وەکوو یەکە لە گوزارەدا بێ وەکوو « کتـــک » و «پشیلە» نابێ بـــە رەگەز دۆزي •

ئەمەش ئەبێ بە دوو بەشەوە ؛ رەگەز دۆزي تـــەواو ، رەگەز دۆزي ناتەواو • تەواوەکە ئەوەیە کە لە هەموو شتێکا وەکوو یـــەک وابن ؛ لە ژمـارەی پیتدا • لە ریکیی پیتەکانا ، لە شـــکلا • وەکوو « نالی » ئەڵێ :

« خەتات فەرموو کە خۆشە چین و مـاچین »
« کە ناچین لێرە ، خۆشەچینی ماچین »

« برۆت هەر چین و پەرچەم چین لە سەر چین »
« ئەمەندە چینە قوربان پێم بڵێ چین ؟! »

وشـــەکانی « چین » و « خۆشە » لەم دوو هۆنـــراوەدا چەنـد جـــار وتراونەتەوە ، لە روخسارا وەکوو یەک وانە • بەڵام لە گوزارەدا جیان •

وشەی « خۆشە » لە هۆنراوەی یەکەمدا کە لە هەر دوو نیـــوە هۆنراوەکەدا هەیە • یەکەمیان بە مانا « خۆشی »یەکە • کە بەرانبەر بە ناخۆشییە • دووەمیان بە مانا « هێشوو »یە •

وشەی « چین » و « ماچین » لە هەر دوو هۆنراوەکەدا « دە » جار وتراونەتەوە ، کە لـە رواڵەتا یەکن ، بەڵام لە گوزارەدا هـــەر یەکە گوزارەیەکیان هەیە •

« چین » و « ماچین » لە نیوە هۆنراوەی یەکەمدا وڵاتی « چین » ـ کە لە ناو کوردەواریدا بە « چین و ماچـین » بە ناو بانگە ـ هەر چەندە چین و ماچین لە هەندە ناوچەیەکی کوردا بە پەلەوەریکی جوانکەلەی

رەنگاو رەنگ ـیش ئەڵێن ، بەڵام لەم شوێنەدا ئەوە نی‌یە ٠

وشەی « ناچین » ، واتە نارروێن ، رەگەز دۆزیەکی وشەیی هەیە لەگەڵ وشەی « ماچین » و بەر « لاحق » ئەکەوێ ٠

« چین »ی سێیەم بە مانا هەڵبژاردنە ٠ وشەی « ماچین » بـــە « بەسە »ی « ماچ » و بۆ گەلە کە لەگەڵ « ماچین »ی یەکەم دا رەگەز دۆزي تەواو لە نێوانیانا هەیە ٠ وشەکانی شەشەم ، حەوتەم ، هەشتەم و نۆیەم بە گوزارەی ریزن ٠ وشەی دەیەم بۆ پرسیارە لە چۆنیەتی و گەوهەری ، گەل ؛ واتە چ شتێکن ؟ ٠

کورتی‌ی گوزارەی هۆنراوەکانیش ئەڵێ :

تۆ ، کە فەرمووت چین و ماچین خۆشە ، باشت نەفەرموو ! ئێمە لەم جێگایە ناجووڵێین هێشۆچنی ماچین ٠ برۆ و ئەگریجەت کەوتوون مە سەر یەک‌دا چین چین ، پێم ناڵێت ئـەم هەموو چینانە وا لە ســەر یەک کەوتوون بۆچ وا بەو جۆرە بە سەر یەکا کەڵەکەیان کردووە و کەوتوون ؟ ٠

ئەو وێنەیە کە هێنرایەوە بـۆ رەگەزدۆزي‌تـــــەواو ، بە ناوی رەگەزدۆزي « وێنە ـ مماثل »یشەوە ناو ئەبرێ ٠

ئەم جـۆرە رەگەز دۆزی‌یە بەشکردنێکی‌تریش هــەیە ، ئەوەش ئەوەیە :

ئەگەر یـەکێ لە دوو وشەکە ؛ ئەوەی کە رەگەز دۆزیـــەکەی دروست کردووە ، جووت و ئەوتیری تاک بوو ، بە ناوی «جــووت ـ رەگەز »ەوە ناو ئەبرێ ـ واتە جناسی مرکب ـ ٠ ئەگەر ئەم جووت و تاکە هــەر دوو وەکوویەک ئەنووســـران بە ناوی « وەک‌یـەک ـ متشابە »ەوە ناو ئەبرێ ٠ وێنەی ئەمە وەکوو « زێوەر » ئەڵێ :

**« داخی حەسرەت نەخشی‌گرت ئەم ساڵ لە تەختەی سینەما »**

**« بۆ ئەوانەی رانەکەن سەر بەست ئەچن بۆ سینەما ! »**

دوو وشەی « سینەما » لە نووسینا وەکوو یەک وانە ؟ یەکەمیان « جووتە » ، واتە لە سینەی منا • دووەمیان تاکـە ، واتە « سینـــەما ـ تەماشاخانە •

وە یا «نالی » ئەڵێ :

**« رەقیب و موددەعی وەک پووش و پووشوون »**

**« بسووتێنین کە وەک بەرقین لە بەر • قین »**

دوو وشەی « بەرقین » لە نووسینا وەکوو یەک وانە ، یەکەمیان تاکەو دووەمیان جووتە •

ئەگەر ئەو دوو وشەیە لە نووسینا وەکوو یەک نەبوون بە ناوی وەگەز دۆزي « جیا ـ مفروق »ەوە ناو ئەبرێ • وێنـەی ئەمـە وەکوو « عەلی کەمال باپیر » ئەڵێ :

**« کە دل شادی نەکەی « دلشاد ، لەبەر چی ؟»**

**« دەبیتە هاو سەری پیاوانی هەرچی ! »**

ئەم دوو « دڵشاد »» لە نووسینا جیان ؟ یەکەمیـــان کەسێکە کە دڵخۆشی بکا و سفەتە • دووەمیان ناوە ، واتە عەلەمە •

لە شێوەی نووسینی ئەم جۆرە شتانەدا ئەگەر هات وشەکە بوو بە « ناو » بە سەریەکەوە ئەنووسرێ • وەکوو « دڵسۆز » • ئەگەر هەر لە سەر سفەتیـــەکەی خۆی مایەوە بەجیا ئەنووســــرێ • وەکـوو « دڵ ســـۆز » •

★ ★ ★

جۆرەکەی‌تر ـ کە رەگەز دۆزي ناتەواوە ـ ئەمەش چەند بەشێک دروست ئەکا • بەشێکیان ئەوەیە کە :

ئەگەر لەکێش و ژمارەی پێت و شکڵا وەکوو یـــەک وا بـوون

بەڵام لە سەر و بۆردا جیا بوونەوە ئەمە بە رەگەز دۆزی « لادەر » واتە « منحرف » ناو ئەبرێ . وێنەی ئەمە وەکوو « ناڵی » ئەڵێ :

**« کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ «کردی»یە ، خۆ کردیە »**

**« هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی مەعنا دەکا »**

رەگەز دۆزی‌یەکە لە نێوانی دوو وشەی « خۆ کردی » دایە . یەکەم بە « بۆر » ئەخوێنرێتەوە ، نیشانەی بۆر لە کوردی‌دا « و »ە » بۆ نووسینی ، واتە « کوردی » . دووەم بە بێ «و» ئەنووسرێ ، واتە « کردی » . وە منیش بۆیەلە دەقەکەدا هەردوکیم بە « کردی »نووسی ، لە بەر شەرح‌کردنەکە بوو ، ئەگینا نووسینی « کوردی » بە «کردی» هەڵەیـــە .

وە یـــا هەر « ناڵێ » ئەڵێ :

**« کە تۆ «قبلە»ی دممت سا بێنە قوربان »**

**« لە بۆ « قبلە »ی دلم‌مەشکێنە قوربان ! »**

هونەرەکە لە نێوانی هەر دوو وشەی « قبلە » دایە ؛ یەکەم «قیبلە»یە بە « زێر »ی « ق » . دووەم « قوبلە » بە « بۆر »ی قاف .

ئەگەر جیاوازی‌یەکە لە ژمارەی پیتەکانا بوو ، واتە ئەو دوو وشەیە یەکێکیان پیتێکی زیاتر بوو لەویکەیان ، ئەمە بە ناوی « ناتەواو »ەوە نـاو ئـەبرێ ، ئـەو پیتـە زیـادەیـە لابـەی رەگـەز دۆزیـەکی تەواو پەیدا ئەبێ . وێنەی ئەمەش دیسان وەکوو « ناڵـــی » ئەڵـــێ : لە کاتێکا کە پیتەکە لە سەرەتای وشەکەوە بێ .

**« لە نێو ریگی رەوان دا (قم) (نقم) بوو ، وشتریش بوو گومە »**

**« ئەما گوێ بیستنی ( قم ، قم ) چ جای ئیمکانی هەستانە! »**

رەگەز دۆزیەکە لە نێوانی « قوم » و « نوقوم »دایە . پیتـی «ن» لە « نوقـــوم » لابەری ـ کە زیادە لە « قـوم » ـ رەگەز دۆزیـەکی

تەواو پەیدا ئەبێ . هەروەها لە نێوانی « قوم » و « گوم »یش دا رەگەز دۆزی « لاحق » هەیە .

ئەمەش وەختێ ئەبێ بە « لاحق » کە حوکم بکەین بەوە شوێنی دەرچوونی دوو پیتەی « ق » و «گ»، لە گەرووودا نزیکی هەیە لــە بەینیانـا .

وە یا ئەو پیتە زیادەیە بکەوێتە ناوەراستی وشەکەوە . وێنەی ئەمە وەکوو « حاجی قادری کۆیی » ئەڵێ :

**« ئەی بێ نەزیر و هەمتا هەر تۆی کە بەر قەراری »**

**« بێ دار و بێ دیاری ، بێدار و پایەداری »**

رەگەزدۆزی وێنەکەی تێمە لە نێوانی « بێدار »و « بێدیار »دایە ، کە پیتی «ی» لە وشەی « بێدیار» لابەی ، لەگەڵ « بێدار » دا ئەبێ بە رەگەز دۆزیەکی تەواو . هەروەها رەگەز دۆزی «جیا» لە نێـــوانی « بێدار » و « بێدار یشدا پەیدا بووە .

وە یـا ئەو پیتە زیادەیە کەوتبووە دوایی وشەکەوە . وێنەکەی وەکوو « گۆران » ئەڵێ :

**« لە لاپاڵی کێو قاسپەی کەو ئەهـــات »**

**« بە بێ کەوش کەوتمە رێ هات و نەهات »**

رەگەز دۆزیە ناتەواوەکە لە نێوانی دوو وشەی «کەو» و «کەوش» دایە ، پیتی «ش» کە کەوتۆتە ئاخری وشەی «کەوش »ەوە ، لا ببرێ «کەو» ئەمێنێتەوە ، لەگەڵ وشـەی «کەو»ی پێشوودا رەگەز دۆزی تەواو پەیدا ئەبێ .



جۆرێکی‌تر لە بابەتی رەگەز دۆزی ناتەواو ، رەگەز دۆزی « هاوتـۆم » ناو ئەبرێ . ئەم جۆرەیان لە بەلاغەی عەرەبی‌دا بە «مضارع»

ناوی ئەبەن ، گوایە لە یەک ئەچن ، من بۆ ئەم چەمکە «هاوتۆم»م بەلاوە فراوانترە .

ئەمەش ئەوەیە کە لە ترۆمدا جایی لە نێوانی دوو وشـەکەدا هەبێ ، بـەڵام بە مەرجێ کە لە یەک پیت زیاتر نەبێ . وە ئەو دوو پیتـەش لە شوێنی دەرچوونەکانیانا نزیکیان پێکەوە هەبێ .

ئەمەش ئەبێ بە سێ بەشەوە ؛ بەشێکی ئەوەیەکە ئەو دوو پیتـە لـە سـەرەتای وشـەوە بن . وێنـەی ئەمە وەکوو « زێـوەر » ئەڵـێ :

« تکا . شکا بە جارێ شەراب و شیشەی دڵ »

. ئەسـراری مەخفیاتم کەوتۆتە سەر زبـانم »

دوو پیتی «ت» و «ش» بە هـەر جۆر بێ شوێنەکانیـان پێکەوە نزیکە . ئەگەر بە حسابی کوردی‌ـش بێ هەردووکیان لە پیتـە بێ دەنگەکانن .

ئەم هۆنراوە وەکـوو ئەمەی تێدایە وێنەیەکیشە بـۆ « پێچـە و پەخشە »ی رێک .

وە یـا ئـەو دوو پیتە کەوتبنە ناوەڕراستی وشەوە . وێنەی ئەمەش وەکوو « مەڵکە جوانرڕۆیی »ئەڵێ :

. گیسۆی قەترانی جە هەر دوو لاوە .

« گیشۆ پەی زاري ئەی جەرگ برراوە .

دوو پیتی «س» و «ش» لە ناوەڕراسی وشەدا لـە جێگای یەک دانراون و شوێنەکانیشیان پێکەوە نزیکە .

وە یا ئـەو دوو پیتی هاو تۆمە بکەونە ئاخری وشەوە ، وێنـەی ئەمەش وەکوو . وافی . ئەڵێ :

. گەر باب بلێ بەزمە لە بام ئەم دەنگی تازە .

. بۆی دێنمەوە نەزمێ لە نـەو تازە بە تازە .

رەگەز دۆزي مەبەستەکە لە نێوانی «باب» و «بام»دایە ، کە دوو پیتەی «ب» و «م» لە ئاخری وشەکەدان و جێگای دەرچوونەکەیان پێکەوە نزیکە ، چونکە هەر دوو بە «لێو» ئەوترێن ، ئەم دووەی لەگەڵ یەکا گۆڕریوەتەوە .



جۆرێکی‌تر لەم رەگەزدۆزي ناتەواوە رەگەز دۆزي «رەدوو»ە ، بۆ ئەم چەمکە گوزارەشتی عەرەبی « لاحق »ی بۆ داناوە . ئەو گوزارشتەی کە من ئەیڵێم ئەوەیە کە یەکێ لە پیتەکان شوێن ئەوی‌تر ئەکەوێ ، شوێن کەوتن ، زمانی کوردی «رەدوو»ی پێ ئەڵێ .

ئەم بابەتەش ئەوەیە کە دوو پیتەکە جێگای دەرچوونیان جیا بێ ، کە وابوو بە رەگەز دۆزي رەدوو ناو ئەبرێ .

ئەمەش دیسان ئەبێ بە سێ بەشەوە ؛ یـا ئەمەیە پیتەکە لە سەرەتای وشەکەوە ئەبێ ، یا لە ناوەراستیا ، یا لە ئاخرەوە ئەبێ .

وێنە بۆ ئەوە کە دووپیتەکە جێگای دەرچوونیان جیا بێ وەکوو « نالی » ئەڵێ :

**« ئەلا ئەی ئاسکی ناسک بە باسک »**

**« شکاندت گەردنی سەد شێری شـەرزە »**

**« ئەلا ئەی نازەنین ئاهــوو بە باهوو »**

**« دلی سەییادی خۆت هێنایە لــەرزە »**

تەماشا ئەکەین وشەکانـی ئاسک ، ناسک ،باسک، ئاهوو ، باهوو هەموو رەگەز دۆزي‌یە ناتەواوەکەیان گرتۆتەوە .

« ء ، ن ، ب » بە چاو پیتەکانی عەرەبی‌یەوە جێگای دەرچوونیان لە دەم جیایە،بەچاو کوردی‌یەوە «ئا» پیتی دەنگ دارە ، ئەوانیتر هەموو پێ دەنگن ، دیسان هەر جیا بوون لە یەک .

بەشی دووەم ئەوەیە کە پیتی رەگەز دروستکەرەکە لە ناوەراستی وشەکەوە بێ • وێنەی ئەمەش وەکوو « میرزامارف » ئەڵێ :

**« ئەرروێن ئێوە بە بێ باکی بە ناو مێرگ و گوڵی دەشتا »**
**« ئەخوێن شیرە ، ئەکەن جەولان بە بێ پەردە لە بای وەشتا »**

وێنەکە لە دووشەی «ئەرروێن» ، «ئەخوێن» خۆی نواندووە • دوو پیتی «ر» و «و» لە شوێنی یەک دانیشتوون و جێگای دەرچوونیشیان لە دەم دوورە •

بەشی سێیەم کە پیتەکە لە ئاخرەوە بێ • وێنەی ئەمەش وەکوو «رەمزی» ئەڵێ :

**« ئەمیر هەستا لە جێگای خۆی ، ئەمین بوو لەو سەرا پەردە »**
**« ئەوی لێی بوون ئەما چاریان • خزانە ناو تەپ و هەردە ! »**

وێنەکە لە بەینی دوو وشەی «ئەمیر» و «ئەمین» دایە ، کە دوو پیتی «ر» و «ن» لە جێگای یەک دانیشتوون و شوێنی دەرچوونیشیان لە زار دوورە لەیەک •



ئەگەر ئەو دوو وشەیە کە رەگەز دۆزیەکەیان دروستکردوە پیتەکانیان تێک چوو بوون ، واتە ریزیان تێک چوو بوو ، من بە «گوێزراوە» ناوی ئەبەم ، هەر چەندە بەلاغەی عەرەبی «تجنیس القلب» ناوی ئەبا • وێنەی ئەمەش وەکوو • نالی • ئەڵێ :

**« خاترێکی شۆخ و خۆش و بێ غەم و جەمعم هەبوو »**
**« ئێستە بۆ زوڵفی کەسێ مەشقی پەرێشانی ئەکا »**

لێرەدا رەگەز دۆزیەکە لە نێوانی دوو وشەی «شۆخ» و «خۆش» دا دروست بووە ، چونکە پیتی هەر دوو وشەکە بە تەواوی گوێزراونەتەوە و شوێنیان گۆرراوە •

وە یا هەر لەم بابەتە «حەمدی» ئەڵێ :

**. ئەگەر ئەو دوژمنە وەک مار لە سەر کلک را بوەستێ بۆم،**

**« بە شیرینی و خۆشی وا ئەکەم تا مــاوە رام بێ بـۆم »**

وێنەکە لێرەدا لە بەینی دوو وشەی «مار» و «رام» دایە کە بــە تەواوی هەڵەوگەڕراونەتەوە .



دیسان ئەو دوو وشە ، کە رەگەز دۆزیەکەیان دروستکردوە . ئەگەر یەکێ لە دوو وشەکە کەوتبوە سەرەتای هۆنراوەکە و ئەویتریان بە هەڵەو گەڕراوەیی کەوتبوە ئاخری هۆنراوەکەوە ئەمە بە «هەڵەوگەڕراوەی باڵدار» ناو ئەبرێ . لە بەلاغەی عەرەبی‌دا بەمە ئەڵێن « مقلوب مجنح » . وێنەی ئەمەش وەکوو « شێخ‌رەزا » ئەڵێ :

**« تەلاق گەر بێ بە دەمیا ئەو زلەی چوار پەل قەوی »**

**« بۆی ئەنێزم سێ زەلام تابیکەنە پەندی قــەلات »**

وێنەکە لە نێوانی دوو وشەی « تەلاق » و « قەلات » دایە . کــە هەر یەک لەم دوو وشــەیە بە پێچەوانەی ئەویتریان کەوتوونەتــە سەرو بنی هۆنراوەکەوە . مەبەستی هۆنەر بە « قەلات » قەلای هەولێرە لە سەر شێوەی هەولێر بە قەلا ئەڵێن قەلات .



لەم جوانکاری وشەیە و لەم رەگەز دۆزیەدا وەکوو ئەم پیشەیــە هەیە ، جوانیەکی تریش هەیە کە لە سەر زمانی زانیاری جوانکاری بە « لەتافەت » ناو ئەبرێ . بە وێنە وەکوو لەو نیوە هۆنراوەدا کە ئەڵێ :

**« کە ناچین لێرە ،خۆشە چینی ماچین »**

« لە خۆشەچینی ماچین »دا ئەم جوانی‌یە دروست بووە ؟ ئەڵێ : ئێمە بۆیە لەم شوێنە نارزوێن چونکە هێشتۆ چنی ماچین» لە هەمانکاتا ئەوەش ئەگەیەنێ کە بڵێ :

ئێمە بۆیە لەم شوێنە ناڕڕوێن چونکە خۆشە ؟ چێنـــی ماچین ،
کەواتە نەڕویشتنەکەمان لەبەر خۆشی ئەو شوێنەیە و بەجێ ناهێڵین •

وە یـا هەر لەم ڕوومەوە « نالی » ئەڵێ :

« ئەهلی تەعدادی مەحاســـن نووســـییان »

« خال یەک و زولفی دوان ، هەر دوو سییان »

لە وشەی «هەر دوو سیان» دا ئەم جوانی‌یە دروست بووە • لـــە لایەکەوە مەبەست ئەوە ئەگەیەنی کە خاڵ و زوڵف سیان ؟ ـ سیان ؛ واتە رەشن ، لە لایەکی ترەوە ژمارەکەی تەواو کردووە ئەڵێ : خاڵ یەک • زوڵف دوو ، واتە دوو زوڵفەکەی ، هەموویان بوون بە سێ • یەعنی لەگەڵ خاڵەکەدا •



# ( دوا بە سەر )

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری وشەیی « دوا بەسەر بە » ئەم هونەرە لە بەلاغەی عەرەبی‌دا بە « رد العجز الى الصدر » گوزارشتی لێی دراوەتەوە • من ئەو گوزارشتە کوردیەم بەلاوە زیاتر جێ خۆیەتی ، چونکە کورتتر و پرر مەعناترە •

گوزارشتی شتێک بۆ شتێکی‌تر ئاشکرایە کە زۆربەی هەر بە خوازە ئەم شتانە کراوە • جا ئەگەر خوازە بێ لام وایە گوزارشتی کوردی‌یەکە رەواترە • ئەوەندە هەیە لەبەر ئەوە کە ئەم جۆرە شتانە تا ئێستە هەر لە سەر گوزارشتە عەرەبیەکە رویشتوون ، دوور نی‌یە هی کوردی‌یەکە تۆزێ گران بێ لە سەر گوێ ، بەڵام کە بڵاو بووەوە بێ گومان ئەو گرانیەی نامێنێ •

جا ئەم هونەرە ئەوەیە کە ئاخری هۆنراوەکە ؛ واتە وشەکەی بگێررێتەوە بۆ سەرەتای بەیتەکە • یەعنی ئەو وشەیە کە لە ئاخری هۆنراوەکەوەیە ، هەر چەشنی وشە لە سەرەتای هۆنراوەکەوە بوترێ •

ئەمە بە چاو هۆنراوەوە ، بە چاو پەخشانیشەوە ئەم رەوشتە هەر هەیە ؛ لەوێ‌دا ئاخری وشەی ئاخر رستەکە بخەیتەوە سەرەتای رستەکەی مەبەست بەم قسەیە ، جا لە هۆنراوا بێ یا لە پەخشانا زۆز بەش ئەگرێتەوە چونکە •

ئەو دوو وشەیە یا لە گوزارە و وشەدا دوو پات کراونەتەوە ، یا وەکوو یەک وانە ؛ واتە «متشابهن» ، یا وەکوو متشابهەکەن ؛ واتە لێی وەرگرتن ـ اشتقاق ـ ، یا وەکوو لێی وەرگرتن کۆیان ئەکاتەوە •

ئەمجا ئەم دوو وشەیەش کە بەم جۆرە بوون ، بوون بە چـوار بەشەوە ؟ یـا ئەوەیە یەکێـکیان لە ئاخری بەیتەکەوە ئەبـێ و ئـەیتریان لە سەرەتای نیوە هۆنراوەی یەکەمەوە ئەبێ • یا لە ناوەوەی ئەبێ ، یـــا لە دوایی‌یەکەیەوە ئەبێ ، یـــا لە ئەوەڵی نیوە هۆنراوەی دووەمـــەوە ئەبێ ـ دیارە ئـەم چـوارەی دوایی هـەر تایبەتی‌یـە بە هۆنراوەوە ـ•

کەوا بوو تێکررا بوون بە شانزە بەشـــەوە • ئەدەبی کوردی و رەوانبێژی ئەدەبی کورد دەستی بۆ هەموویان درێژ کردووە ، بـــەڵام ئێمە لێـرەدا چەند وێنەیەک دێنینەوە ؟ وێنەی تەواو بۆ هـۆنراوەکە ، یەک وێنەش بۆ پەخشانەکە ، وە هەر یەک لەو دوو وشەیەش لـــە پەخشانەکەدا کەوتبنە سەر و بنی پارچەکەوە •

وێنەی هۆنراوەکە وەکوو « عەلی کەمال باپیر » ئەڵێ :

**« بێزارە لە من عالەم ئەمێستا بە هەموو جۆر »**

**« باعث ئەوەیە ! یارمە کەوا لێم بووە بێزار !•»**

تەماشا ئەکەین وشەی «بێزار» دووبات بوەتەوە ؟ یەکێ لە سەرەتای نیـــوە هـــۆنراودی یەکەمەوە ، یەکێ لە ئاخـــری نیـــوە هۆنراوەی دووەمەوە •

وە یا « وەلی دێوانە » ئەڵێ :

**« کە چووم بۆ زیارەت مەزاری شـــەمم »**

**« شەمم دەستی هێنا خستیە سەر دەمم »**

ئەمە وێنەیە بۆ ئەوە کە وشە لە ئاخری نیوە هۆنراوەی یـــەکەم و سەرەتای نیوە هۆنراوەی دووەمەو دوو پات بوویێتەوە • وەکوو وشەی «شەم» ئەمەمان بۆ دەر ئەخا •

وێنە بۆ ئـەوە کە وشە لە سەرەتای نیوە هۆنراوەی یـــەکەم و

سەرەتای نیوە هۆنراوەی دووەمەوە دووپات بووبێتەوە وەکوو ئــەم هۆنراوە کە «حەریق» ئەڵێ :

**«گوڵ لە ناو باخا بەیانی پێکەنی تا ڕۆژ هــەڵات»**

**«گوڵ لە ناو ماڵی منا پێی پێکەنی تا ڕۆژهەڵات !»**

ئەم هۆنراوە لەگەڵ ئەوەدا کە بۆ ئەم وێنەیە هێنراوەتەوە . ئــەو هونەرەشی هەر تێدایە کە یەک وشە لە ئاخری نیوەی یەکەم و دووەمی هۆنراوەوە وتراوەتەوە . هونەری سێیەم کە هەر لەم هۆنراوەدا هەبێ ئەوەیە کە وشەی دووپات کراوە واتە «ڕۆژهەڵات» گوزارەکانیشیان جیایە ؛ یەکەم بە مەعنا «شروق» ، دووەم بە مەعنا «غروب» ە!.

هەر لەم وێنەی دووپاتکردنەوەی یەک وشەدا لــە ســـەرەتای هەر دوو نیوە هۆنراوەوە «سالم»یش ئەڵێ :

**«هەرچێ نیەتت بوو نیگەهت دڵمی بەڵەد کرد»**

**«هەرچێ نیەتم بوو بە موژەت ، دڵ خەبەری دا»**

لێرەدا وشەی «هەرچێ» لە سەرەتای هەر دوو نیوە هۆنراوەکەوە هاتۆتەوە .

ئەمیش جگە لە ئیشەکەی خۆی هونەرێکی تری تێدایە ــ کــە دژیەکە ــ ؛ دوو شتی بەرانبەر یەک کردۆتەوە کە «هەرچێ»یە ـ؛ یەکەم سەیر کردنی تۆ بۆ من ، تێی گەیاندم لە نیازت بەرانبەر بــە من ، دووەم سەیر کردنی من هی برژانگی تۆ ، دڵم خەبەری دامێ کە نەشتەرێکە و ئاراستەی من کراوە ! .

وێنە بۆ ئەوە کە یەک وشە دووپات بووبێتەوە ؛ یەکێ لە ناوەندی هۆنراوەکەیدا بێ و یەکێ لە ئاخری نیوە هۆنراوەی دووەمەوە بێ ، دیسان وەکوو «سالم» ئەڵێ :

**« له دەریای میحنەتا هەلپە ئەکەم بۆ غەم بە دەست و دەم «**

**« له جەولانام ، بە هەر لادا ، گوزەرگامە لەنی پرو غەم ! »**

وشەی «غەم»ی بەو جۆرە وتمان دوویات کردۆتەوە .

وێنەی «پەخشان»،کەش وەکوو لەم پارچەیە دا هەیە کە ئەڵێ :

**« سەر ئەکەمە سەر سەرین ، لە باتی ئەوە خەو هێلانە بکا لـــە چاوما ، کەچی وەکوو هومای باڵ‌تیژ بە گورر ، بۆی ئەدا لە شەقەقەی باڵ ، چاوم ئەکا بە « خوێ دان » ، گێژی ـشی روو ئەکاتە سەرم ! ».**

سەیر ئەکەین وشەی « سەر » لە سەرو بنی پارچەکەوە دوویات کراوەتەوە .



# « سەروا دار »

« سەروادار » لە گوزارشتی زمانی عەرەبی‌دا بە « سـجع » ناوبراوە ، « سەروا »ش هەیە کە لە شێوەی عەرەبی دا بە « قافیـە » ناوی دەرکردووە ، بە پێویستی نازانم شەرحی ئەم چوار وشەیە لێرەدا کە ئەمانە بە چ جۆر و لە چ روویەکەوە کراون بە ناو بۆ ئەو چەمکانە؟، هـەر ئەوەندەیـە ئەڵێم « سـەروادار » « سجع » و « سـەروا » « قافیـە » .

ئەم سەرواداری‌یە ، واتە ئاوازەکەی ، گەشەیەکی نەفسی‌ی ئەدا بـە گوێگر ، بە جۆرێـک ئەیداتێ و بۆی ئەشنێتەوە لە وانەیە خۆی لە بیر بچێتەوە ! .

دیارە ئەم سەرواداری‌یە لە ئاخری ئـەو رستانەوە ئەبـێ کـە پەخشانەکە دروست ئەکەن ، ئەم هونەری سەرواداری‌یە هی پەخشـانە ، وەکوو « سەروا » هی هۆنراوە .

ئەبێ چەند شتێک لەم سەرواداری‌دا بێتە دی، ئەبێ وشەکانیان نەرم و نیان و ناسک بن ، ئەبێ ئەو رستانە روو بەرووی یەک بوەسـتن و ئاخرەکانیان لە پیتە دەنگدار و بێ دەنگەکانا یەک ئاوزەیان هەبێ ، ئەبێ بە جۆرێ بن ، کە لە پێشا گوزارە ئامادە کرابێ و پاشان خرابنە قاڵبی وشەکانەوە ، ئەبێ ئەو رستانە کە سـەرواداریەکەیان دروسـتکردووە ئاشنایەتیان پێکەوە هەبێت ، نابێ لەیەک دا بپچرێن .

هەموو لەبەر ئەمانەیە بۆیە « سەروادار » کەوتۆتە ناو چوار چێوەی هونەری جوانکاري وشەیەوە .

بێجگە لەمانە چەند دەستوورێـکی‌تر لەم سەرواداری‌یەدا هـەیە و ئەبێ بە چەند بەشێـکەوە .

بەشێکی ئەوەیە کە خاوەنی «کێش»ە و سەرواى تێدا نی‌یە ،
بەشێکی پێچەوانەی ئەوە ، واتە سەروا هەیە و کێش نی‌یە .

بەشی یەکەم ـ کە کێش دار و بێ سەروایە ـ وەکوو ئەڵێ :

**« گیانی بە دەنگ و باسی گەلێ عیلمی بە نرخ گەشانلۆتەوە .
پاشان پێی ناوەتە مەیدانی هۆنەران و کەوتۆتە رەوتەوە » .**

لێرەدا نە « گەشاندۆتەوە »و ، نە « کەوتۆتە رەوتەوە » لە هەموو لایەکی سەروا داری‌یەکەدا وەنەبێ یەک بن ، بەڵکوو جیان ، هەرچەندە درێژەکان لە کێش‌دا هاوشانی یەک ئەکەن ، ئەوەش مەبەستی ئەم بابەتە نی‌یە .

بەشەکەی‌تر کە پێچەوانەی ئەوەی یەکەمە ؟ واتە سەروا هەیەو کێش نی‌یە ، ئەمەشیان ئەبێ بە سێ بەشەوە :

**« هاوسەر ـ مطرف » . « هاوکێش ـ متوازن » . « هاو روو ـ متوازی » .**

«هاوسەر» ئەوەیە کە چەند رستە و بەندێکە بە شوێن یەکدا دێن، لە پیتی دوایی‌دا وەکوو یەکن ، بەڵام لە لایەن ژمارەی پیت و کێشەوە جیان . وەکو ئەڵێ :

**« پێشەنگی کاروانی دووڕناسان ، خەرقە پۆشی ئاهەنگی مەی نۆشان ، شەیدا بە نووری پاکی یەزدان ، مەفتوون بە سۆزی نالەی دەروێشان » .**

لێرەدا لە دوو پیتی دوایی‌دا وەکوو یەکن ، کە هەموویان «ا»ن»ە ، بەڵام لە کێش‌و ژمارەی پیتەکانا جیان .

« هاوکێش » چەند سەروایەکن لە چەند رستەیەکی بە شوێن یەکدا درووست ئەبن ، لە کێش‌دا روو بە رووی یەک ئەوەستن ، بەڵام لە پیتی بنچینەیی‌دا جیانەبنەوە . وەکوو ئەڵێ :

**« ئەو نازدارەی ئاهوو نیگارە ، لە ناو شەپۆلی شەوی بەهارا .**

**که گزنگی‌دا به بێ‌ترس‌و لەرز ، دای لە دیمەنی گوڵاڵەی گەشـــاو ، ڕەنگ و بۆ دایـــگرت ئاسۆی زمناکۆ ، لــە هەر لایە هات دەنــگی قریوە ! » .**

ئەمانە کێشیان هەیە ، بەڵام لە پیتی بنچینەیی‌دا جیا بوونەتەوە ، وا دێتە بەر چاو کە گوایە لە بەر ئەوە لە پیتی بنچینەیی‌یەکەدا جیـــا بوونەتەوە ، لــە کێشەکەشا هەر جیا بوونەتەوە ! ، لەگەڵ ئەوەشـــا وا نی‌یـــە .

ئەم هاوکێشە تایبەتی نی‌یە بە پەخشانەوە ، بەڵکوو لە هۆنراویشا دێتەدی. کە ئەڵێن : هۆنراو ، نەک هۆنراوی جووت سەروا ، بەڵکوو لە هۆنراوێکی نێوانی چامەدا ، وە یـا هەر تاقانەدا ، وەکوو ، سافی ئەڵـــێ :

**« لەو دڵارامە بپرسن وا دڵ ، ئارامی نەمـــا ،**

**« جارێکی چارێکی دەردم کا ، دەخالەت بەو دەکەم » .**

«هاورووە» . ئەم بەشە ئەوەیە کە سەرواکان لە دوایی ئەو ڕستانەوە دێن کە بە شوێن یەک دان. ئەمانە لە هەموو ڕوویەکەوە ڕێکن ؛ لــە کێش و ژمارەی پیت و تەنانەت لە پیتی پێش پیتی بنچینەیی‌شدا هــەر یەکن. پیتی بنچینەیی ئەوەیە کە سەرواکە لە سەر ئەو ڕاوەستاوە. وەکوو ئەڵـــێ :

**« کانیاوی بەفراوی سەر چیاکان بە خوڕو لە کاتی بەهارا ئەڕڕژێنە خوارەوە ، گوڵ ئاوی شـــەکراوی سەر گۆنایان وەکـــوو مرواری لە ساتی نیگادا ئەکەوێتە زارەوە ! ».**

کە وابوو بە جۆرێــکی تێکرایی ، سەروادار ، لە چوار بەشـــی سەرەکی‌دا جێگای خۆی کردەوە .



گەلێ جاری واش ئەبێ کە سەروادار لە پەنـــدی پێشـــینان و

چیرۆکی ئەفسـانەیی ـ شدا دێنە دی ٠ وەکوو لە پەندی پێشینانـا ئەڵـێ :

**« بووکەکەی پەنا دیواریت ، رۆژ هەموو رۆژ بەتاڵیت ، بە شـەو ناو ماڵ ئەماڵیت »**

**« بووکێکمان هەیە ناشی و نەزانە، تاوێ هۆرر ئەکا ، تاوێ هەمانە»**

**« نان جۆ ، دۆی ترش ، ئەخۆی بخۆ ، ناخۆی چش ! »٠**

**« وەختی ئیش و کار ئەمانکەی بە یار ، وەختی چز و بز ئەمانکەی بە دز ! »٠**

**« سوورەی مل پانە ، مووچەی تۆ هەر دوو نانە » ٠**

**« برروانە هام سەران ، بزانە چێش مەکەران »٠**

**« هەر دمونە و ئەبێ بە دار ، لە بنیا دائەنیشن فەقیر و هەژار»٠**

لە چیرۆکیشا وەکوو ئەڵێ :

**« ئەو رۆستەمی داستانە ، ئـەو پـالەوانی زەمـــانە ، گورزی هەڵسووورراند و دایهێنا ، لەگەڵ ئەستێرانی جووت ئەکرد ، پـرزی ئاگری لێ‌ی دەباری ، کە لێ‌ی دا خستی ، جووتە چۆکێکی ئەو تۆی لە دەفەی سنگی دا ، یەکێ ئەو تۆی لێ‌ی بەردا ، گاسنی تەورێزێ پێ‌ی سوور بکرێتەوە ! » ٠**



# دوو سەروا

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاریی وشەیی بابەتی « دوو سەروا »یە. ئەم بابەتە بەلاغەی عەرەبی بە « تشریع » ناوی ئەبا ، بەڵام من لەگەڵـــێ رووەوە « دوو سەروا »م بۆ ئەو چەمکە بـــەلاوە باشترە هـەتا وشـەی « التشریع » بۆی ؟ واتە بۆ چەمکەکە .

جا ئەم دوو سەروایەش ئەوەیە کە هۆنراوەکە لە سەر دوو سەروا دابمەزرێ ، واتە ئاخری هۆنراوەکان بە جۆرێ بن کە وشە ، وە یـا رستەی پێش وشە و رستەی دوایی ئەوانیش سەروایان هەبێ . ئەمجا لە سەر هەر یەک لە سەرواکانا راوەستی ، ئایا سەروای دوایی بێ یـا سەروای پێش دوایی بێ مەعنا تەواو بێت و هیچ ناتەواوی تێدا نەبێ .

تەنانەت زیاد لەو ناساندنەکە زانایانی بەلاغە کردوویانە ، مـــن ناساندنێکی زیاتری ئەخەمە سەر ، کە ئەمە زیاتر هەر لـە رەوانبێـژیی کوردیدا ئەبێ . ئەوەش ئەوەیە :

ئەگەر هۆنەر ویستی لە سەر یەکێ لە سەرواکان راوەستێ ، ئەوا راوەستاو کە ، کەرتەکانی جیا کردەوە ئەوانەی پێشوو خۆیان کێشـی تەواو و گوزارەی تەواو و سەروای تەواویان ئەبێت . کەرتەکانیش کە بخرێنە سەر یەک ، ئەوانیش وەکوو ئەسڵەکە کێش و گـــوزارە و سەروای تەواویان ئەبێت .

ئەم جۆرە هۆنراوانە بەلای منەوە ئەو هۆنراوانـەن کە پێیـان ئەڵێن « زیـادکراو ـ مستزاد » . جا وێنە بــۆ ئەمە وەکوو « نالی » ئەڵـــێ :

« ئەی تازە جەوان پیرم و افتادە و کەوتـــووم
تا مــاوە حـــــەیاتم »
« دەستێ بلەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم
قـــــوربانی وەفــاتم »
« تۆ یوسفی نەو حوسنی لە سەر میسری جنانی
من پیـــرم و فانی »
« لەم کولبەی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم
هەروا بـــە تەماتم »
« فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عنایــەت
وەحشی لە ولایەت »
« لەم گۆشەی وێرانەیە هەر مامەوە وەک بووم
وەیشـــوومی ولاتــم »
« ئەی قوببەی «طیبە» کە دەڵێی حوققەی «طیبی»
ماوای حەبیبـــــی »
« مسکینم و بەو خاکە عەتـــــرناکەوە هــاتووم
بەو بۆنەوە هــاتم »

ئەمانە لێرەدا هەموو دوو سەروان ، ئەگەر بڵێ :

« ئەی تازە جەوان پیرم و افتادە و کەوتووم »
« دەستێ بلەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم »

کێش و گوزارە و سەروایان تەواوە و هیچ نارێکیەک پەیدا نابێ و یەکێک لە هەشت کێشەی عەرووز پڕرر ئەکاتەوە .

ئەگەر خۆ کەرتەکانیشیان بخرێنە سەر ، دیسان کێش و گوزارە و سەروا تەواوە و ئەکەونە بەر کێشێــکی تر لە هەشت کێشەکە .

ئەگەر کەرتەکانیش بخەینە سەر یەک ، ئەوانیش بۆ خۆیـــان کێش و گوزارە و سەروایەک بۆ خۆیان دروست ئەکەن .

وەکوو ئەوە بڵێی :

« تا ماوە حەیاتم ، قوربانی وەفاتـــم »
« من پیرم و فانی ، هەر وا بە تەماتـــم »

**« وەحشی لە ولایەت ، وەیشوومی ولاتم »**

**« ماوای حبیبی ، بەو بۆنەوە هــاتم »**

* * *

هەر چەندە لە بارێکی‌ترا ئەم دوو سەروایە ئەڵێن ئەوەیــە کە هۆنراو لە سەر کێشی عەرووز بررواِ ، ئاخری نیوە هۆنراوەی دووەم دووپات کرابێتەوە ، پێش ئەو سەروایەک هەبێت ، هەموو چامەکە لــە سەر ئەو و پێش ئــەو برروا . ئەمە لە دوو لاوە ناتــەواوی تێـــدا ئەبێ .

یەکێ ئەوە کە نیوە هۆنراوەی یەکەم لە سەر کێشێک ئەرروا و هی دووەم لە سەر کێشێکی‌تر . ئەمەیان چاوی لێ ئەپۆشرێ ، چونکە مەرج نی‌یە هەر دوو نیوە هۆنراو بە یەک کێش دا بررۆن .

دووەم ئەگەر رێک و پێکی مەعنا لەم بابەتی دوو سەروایەدا بــە مەرج بگــیررێ ـ وەکوو بەلای هەندێ لە زانایانی بەلاغــەوە مەرجە ـ ئەو رێک و پێــکی مەعنایە نایەتە دی .

جا وێنە بۆ ئەم بابەتە وەکوو « زێوەر » ئەڵێ :

**« با نەچێتە لای رەقیبان یار ئەنیسی خانە بێ .**

**« لازمە ئەو ئاسکە لەو لا نەبێ ، لەو لا نەبێ .**

**« دیدە وەختێ تۆی لە لا حازر نەبێ وا حەز ئەکا .**

**« بۆ نەزمی لەعل و دووری یەکتا نەبێ ، یەک تا نەبێ »**

**« عارفی حەق بێ چ باکی زینەت و ئارایشە »**

**« وای ئەوێ ناو شار و ناو دێ وا نەبێ ، دێوانە بێ .**

**« دۆستی و خزمی لە ماوە بۆ رەفیقی خۆی فەلاح »**

**« حەز ئەکا بەو شەرتە ئەمر بێ گا نەبێ ، بێگانە بێ »**

... ... ... ...

... ... ... ...

## « بوونی پێویستە »

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاریی وشەیی ، ئەو بابەتەیە کە ئێمە بە ناوی « بوونی پێویستە » ناوی ئەبەین ، بەلاغەی عەرەبی بۆ ئەم چەمکە « لزوم ما لایلزم »ی بۆ داناوە .

ئەمەش هێنانی شتێک لە هۆنراو وە یا پەخشانێکی ئەدەبیدا کە سەروادار بێ ، ئەو شتە ئەگەر نەبێ سەروای هۆنراوەکە ، وە یا سەرواداری‌یەکە لەو پەخشانەدا بەو جۆرە دروست نابێ ؟ واتە نە هۆنراوەکە ئەبێ بە هۆنراوێکی خاوەن سەروا ، وە نە پەخشانەکە ئەبێ بە پەخشانێکی سەروادار . بە تایبەتی لە پەخشانەکەدا ، چونکە ئەگەر ئەو شتە نەبێ پەخشانەکە ئەبێ بە پەخشانێکی‌تر ، یا هەر وا ئەبێ پەخشانێکی اعتیادی ، یا ئەبێ بە پەخشانێک کە شێوەی سەرواداری‌یەکەی جیا ئەبێ لەو شکڵە پەخشانە سەروادارە کە تۆ بینت پێوە ناوە و ئەتەوی تایبەتیەکی جیاوازی هەبێ .

ئەو شتەش کە ئەڵێن بوونەکەی پێویستە ، یا پیت و دوو پیتەکەیە کە پێش پیتی بناغەیی سەرواکە و سەرواداری‌یەکە کەوتوە ، یا جووڵان ـ حەرەکەیەکە ـ هەر لە پێش ئەو پیتی‌بناغەیی‌یەوە « رویّ »ە . ئەگەر ئەمانە نەبێ نە سەرواکە دێتە دەست لە هۆنراودا ، وە نە سەرواداری‌یەکە دروست ئەبێ لە پەخشانەکەدا .

بە وێنە لێرەدا « مەحوی » ئەڵێ :

« زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە تیرۆک »
« لەتێ نانت دەداتێ دوو بەشی نۆک »
« پیاڵە دیدە لەبرڕێزە دڵا تۆش »
« بجۆشە سازی ناڵە هەم ببێ کۆک »

ئەو دووە کەراوانە شتێکی پێویستە بەو جۆرە لە ئاخری

هۆنراوەکانەوە بێ ، ئەگینا سەرواکە ڕێ ناکەوێ . نەبوونـەکەی
وەنەبێ پێویست بێ . بەڵام دروستکردنی سەرواکە ئەو پێویست نەبوونە
وا لێی ئەکا کە هەر ئەبێ بوونەکە بێ ؟ واتە ئەو شتە کە هەرج نی‌یە
بێ ، ئەبێ بێ ، نابێ نەبێ .

وە یا « سالم » ئەڵێ :

**« دەناسی قاتلی دل گەر نگەه کەی سووی موژگانت .**
**. ئەدا کە خوینبەها سا بۆسەی دەستم بە دامانت .**
**. تەواو نابێ لە سەودای عارزت بۆ دل گرفتاری .**
**. لە داوی توررە بەر بوو کەوتە ناو چاهی زەنەخدانت .**

لێرەدا بۆ ڕێکیی سەرواکە « ا » و « ن »ەکە پێویستە ، ئەگـەر
نەبێ سەروای هۆنراوەکە نابێ .

لە پەخشانیشا وەکوو ئەم پەخشانە کە ئەڵێ :

**« کۆکەی کزی ، چاوی بزی ، دەستی دزی ، لاقی خزی . ئەمانە
وا بوون . بەڵام کە کەوتە رەوت . دانیشت و کەوت . بەو جـۆرە
خەوت ! » .**

لەم دوو پارچە سەروادارەدا «ی» لە یەکەما و «ت» لە دووەما بوو
بە پیتی بناغەیی بۆ سەرواداری‌یەکە . «ز» لە یەکەماو «و» لە دووەما
بوون بە شتێک کە بە بێ ئەوان ئەو سەرواداری‌یە بەم جۆرە دروست
نابێ . کەوا بوو بوونەکەیان بوو بە شتێکی پێویست بۆ ئەم شوێنە .

بەڵێ ئەگەر ئەوانە نەبن سەرواداری‌یەکە دروست ئەبێ ، بەڵام
بۆ شتێکی‌تر و جۆرە پەخشانێکی‌تر دروست ئەبێ ، نەک بۆ ئـــەو
پەخشانەی کە نووسەر شتێکی تایبەتی پێی مەبەستە .



لەگەڵ ئەمانەدا ئەبێ ئەوەش بزانرێ کە مەبەست لەم جوانکاری‌یە
ـ بە هەر دوو بەشەکەیەوە ـ ئەوەیە کە وشە ئەبێ بکەوێتە شوێـــن

گوزاره • فراوانیی و ڕێ و شوێنی گوزارەکە چۆنە وشەکە ئەبێ ئەو ڕێبازە بگرێ • ئەگەر هات و گوزارەکە کەوتە شوێن وشە ، ئەوەی کە ڕەوانبێژی داوای ئەکا ئەوە دروست نابێ •

بەڵێ ڕاستە وشە بە هیچ جۆر گوزارە پڕ ناکاتەوە ، بەڵام ئەگەر ئەوەش بێت بە سەرا کە گوزارە بکەوێتە دووی وشە ، ئەوە هەر بە تەواوی هەناوی جوانکاری ئەبڕ-ڕێ ! • وەکوو ئەوە تەماشا ئەکەی هەندێ لە هۆنەران پێش دانانی پارچە هۆنراوەکەی دێنێ چەند وشەیەک بۆ سەرواکەی ڕیز ئەکا و پاشان بە زۆر گوزارەی تێ ی ئەترنجێنێ ! •

دێنێ لە پێشا چەند وشەیەکی وەکوو • بار ، تار ، خار ، دار ، زار ، شار ، کار ••• هتد ، دائەنێ و پاشان هۆنراو لە سەر ئەم وشانە – کە کردوونی بە سەروا – دا ئەنێ و بە زۆر گوزارە ئەخاتە ناو هۆنراو و سەرواکانەوە ! • گومانی تێدا نی یە ئەمە ئەو پاراوی و جوانکاری یە کە ئەبێ هەبێ لە زمانا ، نابێ •

وەکوو ئەم دەستوورە هەیە کە ئەبێ وشە شوێنی گوزارە هەڵگرێ • نابێ مرۆڤ بێ ئاگا بێ لەوەش کە بڵێ مادام وشە شوێن هەڵگری گوزارەیە ، من دێنم وشەکە بە زۆر ئەخوێنمەوە بە سەر گوزارەکەدا • ئەمەش هەر نابێ • وشەو گوزارە وەکوو گوڵ و گوڵدان وانە ، گوڵی جوان ئەبێ لە ناو گوڵدانی جوانا بێ •

کەوا بوو وەکوو پەندە کوردی یەکە ئەڵێ : « نە شیش بسووتێ و نە کەباب ! » ئەبێ گوڵ ، گوڵی بوێ •

# ( دزي لە هۆنراودا )

لەم باسی جوانکاري وشەیی‌یەدا شتێکی‌تر هەیە کە بە تـەواوی ئاشنایەتی بەم شوێنەوەیە ـ ئەوەش باسی دزي کردنە لە هۆنراو ، وە یـا پەخشان دا ـ

کابرا دێنێ هۆنراوی یەکێکی‌تر ئەکا بە هی خۆی و ناوی خۆی لێ ئەنێ ، وە یا تۆزێ سەرو گوێلاکی ئەکا و ئەڵێ ئەمە هی منە ! ـ هەروەها لە پەخشانیشا ئەم ئیشە ئەکرێ ـ ئەم هی یەکێکی‌تر بە هـــی خۆ کردنە لە دزي مـــاڵ و سامان خراپترە ، چونکە فیـکردزین ، دزینی مێشکێکی رۆحی‌یە ، ماڵ دزین سامانی ماددی‌یە ، رۆح لە ماددە بەنرخترە ٠

بەڵام ئەگەر گوزارەیەک دوو وشەی هەبوو ، هۆنەرێـــــک وشەیەکی بەکار هێنا و هۆنەرێکی‌تر وشەکەی‌تری ، ئـەمـە بە دزي دانانرێ ـ وە یـا رێ ئەکەوێ دوو هۆنەر ـ با لە یەک سەردەمیشـا بن ـ لەوانەیە ئاگاشیان لە یەک نەبێ ، هەر دووکیان ، دوو گوزارە ، وە یا یەک گوزارە دێ بە دڵیانا و هەر یەکە بە چەشـەی خـــۆیان گوزارشتی لێ‌ی ئەدەنەوە ، ئەمەش وەنەبێ بە دزي ناو ببرێ ، بەڵکوو بەوە نلو ئەبرێ کە دوو کەس زەینیان بۆ یەک شت وەکوو یەک بووە ، دیسان ئەگەر دوو کەس شتێکیان وت ، واتە زەینیان بۆ یەک شـت وەکوو یەک رویشتبوو ـ هی دووەم گوزارشتی بۆ شتەکە لەوانە بوو بەهێزتریش بێ ـ وە لەوانەش بوو هەر لە یەکەمیشی وەرگرتبێ ، دەست پێشکەري هەر بۆ ئەوەی یەکەمە ٠

ئەگەر دوو کەس مەعنایەکیان وەرگرت ، ئەوەی دووەم یا ئەمەیە وەرگرتنەکەی بە پێزترە لە هی یەکەم ، یا وەکوو ئەو وایە ، یا لــە خوار ئەوەوەیە . ئەوەی یەکەمیان بە باش ناو ئەبرێ و رەخنە رووی تێ ناکا ، ئەوەی دووەم ، واتە بەرهەمەکەی ، رەخنە کەمتر رووی تێ ئەکا ، بەڵام دەست پێشکەری هەر بۆ یەکەمە ، ئەوی سێیەم بە تەواوی ئەبێ بە هێلانەی رەخنە .

دیارە ئەم بەشکردنە بەم جۆرە وەکوو بۆ گوزارە وایە ، بــۆ وشەش هەر وایە . لەگەڵ ئەمانەشا هەموو دەم داهێنان باشترە ، تــا بەدوو کەوتن و شوێن هەڵگرتن .



بەهۆی ئەم باسەوە چەند بابەتێکی‌تر لە هونــەری جوانــکاری وشەیی سنگ دێنێتە پێشەوە ، چار نی‌یە هەر ئەبێ لەم شوێنەدا باسکرێ‌ە یەکێک لەوانە :

« **لێ‌ی وەرگرتن** » .

لێ‌ی وەرگرتن وشەیەکە بۆ هەموو شت ئەبێ ؟ واتە شتێکــی گشتی‌یە ، هەر شتێکی ماددی ، یا مەعنەوی لە شتێکی‌تر وەربگیرێ . هەر لێ‌ی وەرگرتنە . بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە هونەر ، وە یــا نووسەر هەندێ وشە بە گوزارەکەیەوە لە شتی‌تــــر وەر ئەگرێ و ئەیخاتە ناو بەرهەمەکەی خۆیەوە .

ئەمە بەلای زانایانی بەلاغەی عەرەبی‌یەوە بــــە « اقتباس » ناو براوە « اقتباس-یش هەر بۆ ئەو چەمکەیە کە وترا . وەکوو لــــە وێدا لە گوزارەی گشتی‌یەوە گوێزراوەتەوە بــۆ تایبــــەتی ، لە

کوردی‌یه‌که‌شا له «کلی»یه‌وه گوێزراوه‌ته‌وه بۆ «جزئی» .

جا ئه‌م لێی وه‌رگرتنه ئه‌وه‌یه که به‌رهه‌می که‌سێکی تایبه‌تـــی شتێکی‌تر بخاته ناو خۆیه‌وه ، به‌لام نه‌ک به‌و ناوه‌وه که ئه‌مه لـــه‌وه ، واته باسی خاوه‌نی لێی وه‌رگیراوه‌که نه‌کا ، چونکه ئه‌گه‌ر باسی کرد ، وه یا ناوی هێنا ، ئه‌مه به چه‌مکی لێی وه‌رگرتن ناو نابرێ ، به‌لکوو ئه‌بێ به «تیه‌لکێش» .

لێی وره‌گرتن له هۆنراو و له په‌خشانیشا ئه‌بێ ، وه‌رگرتنه‌که‌ش ته‌نیا بۆ جوانکردن و پیرۆزکردنی به‌رهـــه‌مه‌که‌یه ، هی ئه‌و که‌سه که وه‌ری ئه‌گرێ .

دیسان له‌گه‌ل « تیه‌لکێش »دا به‌وه‌ش هـه‌ر جیا ئه‌بێته‌وه کـــه وه‌رگرتنی تیه‌لکێش له نیوه هۆنراو که‌متر نی‌یه ، هی « لێی وه‌رگرتن» پارچه‌یه . وه له‌ما، هێما ناکا به لێی وه‌رگیراوه‌که . زیاتر ئه‌م لێی وه‌گرتنه‌ش هه‌ر روو به رووی « قرآن » و « حدیث » ئه‌بێته‌وه .

جا وێنه بۆ ئه‌م لێی وه‌رگرتنه لـــه هۆنراودا ، کـــه لـــێی وه‌رگیراوه‌که « قرآن » بێ . وه‌کوو « حیره‌ت » ئه‌لێ :

**« عیلاجی من له ساحه‌ی مێحنه‌تا «صبر جمیل »ه ».**
**« ده‌لیلی من خوایه‌که ، که وا « نعم الوکیل »ه » .**

له « حدیث »یشا هه‌روه‌کوو ئه‌و ئه‌لێ :

**« ( الجنة حفة بالمکاره ) زمایانه له رووتا .**
**« نی‌یه ناهه‌ق ئه‌گه‌ر دایم هه‌رراکه‌م من به دووتا .**

له په‌خشانیشا وه‌کوو ئه‌م ده‌قه که ئایه‌تێکی « قرآن »ی تێدایه و ئه‌لێ :

**ئەوانەی کە ڕێگای چاکەیان گرتووە ، ئەو چاکە کردنە وەنەبێ هەر بۆ خەڵک بێ ، بەڵکوو نەفعەکەی بۆ خۆی زیاترە ! « ان احسنتم احسنتم لانفسکم » خراپەکردنیش ئەگەر بیکا هەر بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە ( ان اسأتم فلها ) » .**

وێنەی ئەوەش کە « حدیث » بخاتە ناو پەخشانەکەیەو ، وەکوو لەم دەقەدا ، کە ئەڵێ :

« بەنی ئادەم نابێ هەر وا بزانێ کە گیانلەبەرێکە و هیچیتر ، بەڵکوو گیانلەبەرێکە ـ جگە لە مێشکەکەی ـ هەموو «کان» ێکیشـــی تێدایە « الرجال معادن » ، لە ئەرزا ئاسن و گۆگرد وخۆی و شتیتر هەیە ، لەمیشا هەیە .



# تیەڵکێش

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاریی وشەیی « تیەڵکێش »ە بەلاغەی عەرەبی سە « تضمین »ی ناو بردووە .

« تیەڵکێش » لە بارەی رەوانبێژی‌یەوە ئەوەیە کە هۆنەر دێنێ هۆنراو ، وە یا نیوە هۆنراوی یەکێکی‌تر ئەخاتە ناو هۆنراوی خۆیەوە ، وا ئەبێ بە هێما ، وە یا بە ئاشکرا ناوی هۆنەرە لێی وەرگرەکە ئەهێنێ ، وە یا لەبەر ناو بانگیەک کە هەیەتی ناوی ناهێنێ . بەم ناو هێنانە ، وە یا هێما بۆ کردنە ئیتر لەوە دەر ئەچێ کە بوترێ ئەمە لە یەکێکی‌تری وەرگرتووە ، وە یا دزیویەتی . مەرجیش نی‌یە ئەو تیەڵکێشە کە ئەیکا هەر لەو زمانەدا بێ ، بەڵکوو بۆی هەیە لە زمانی‌تریشەوە بۆی بێنێت . تا ئەمەیان زیاتر لەگەڵ زمانی کوردیدا رویشتوە تا عەرەبی و فارسی .

بەلای هەندێ لە زانایانی بەلاغەوە هۆنەرەکە لە باتی ئەوە هۆنراوێک ، یا نیو هۆنراو بێنێت ئەتوانێ پارچەیەک لە نیو هۆنراو بێنێت و بیخاتە ناو هۆنراوەکەی خۆیەوە .

بەلای منەوە ئەمە نابێ ، چونکە ئەگەر وای کرد لەگەڵ لێی‌وەرگیراوا جیا نابنەوە ، بە تایبەتی لە کاتێکا کە هێمایەک نەبێ بۆ خاوەنەکەی .

ئەمەو دیسان « تیەڵکێش » هەر ئەبێ لە هۆنراودا بێ ، لە پەخشانا نابێ ، چونکە هیچ « ایداع » وجوانکاریەکی تێدا دەر ناکەوێ .
ئەمجا وێنە بۆ ئەمانە .

«پیرەمێرد» هۆنراوی «مەولەوی» هێناوە و خستوویەتە ناو هۆنراوی خۆیەوە و ئەڵێ :

**« لە دواوان دا کە یەک ئەکەوی »**

**« دوو ( مصرعی ) بۆ بەیتی مەولەوی »**

**( « سیروانی ئەم چەم « کانجەرۆی ئەو چەم «**
**بەمن بە یەک دا ئەم چەم « لا ئەو(٥» ; لەنە**

وە یا « **ناري** » نیوە هۆنراوی « تاهربەگ » ئەخاتە ناو هۆنراوی خۆیەوە و ئەڵێ :

**لە رووی ئەو ماهەدا وەستام بە نەومیدی و خەمباري**

**( « شکاندی پەنجەکەم تـا من نەنووسـم وەسفی روخساری ! » )**

وە یا «سالم» ئەڵێ :

**لە ئیدراکی شکەنج و عوقدەی زوڵفت پەرێشانم**

**( « کە کس نگشود و نگشاید بە حکمت این معمارا » )**

وە یا « شوکری فەزلی » ئەڵێ :

**« مەکەن لۆمەم ئەمێستە وا نەزانی »**

**( « متی اضع العمامة تعرفوني » )**



# تیل نیشان

یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری وشەیی « تیل‌نیشان » ـە • بۆ ئەم چەمکە زمانی بەلاغەیی عەرەبي « تلمیح »ی بۆ داناوە •

« تیل‌نیشـــان » ئەوەیە کە ئەو هۆنەرە لە هۆنراوەکەیا بە تیلـــی چاو دەست بۆ کارەسات ، وە یا داستان ، وە یا پەندێکی پێشینانی ئـەو زمانە درێژ بکا •

بـۆ داستان و کارەساتەکە وەکوو « مـەلای جەباری » لـــەم وێنەیەدا ئەڵێ :

**« خەم چەشمەی حەیات کەس نە نۆشا کرد »**

**« چەن کەس چون یوسف خەریکی چاکرد »**

ئیشـــارەیە بە داســـتانی ئاوی حەیات کە هەرکەس بیخواتەوە نامرێ •

ئەم کانیاوەش لە رۆژاوای قەڵەمرەوی سەر دەمی ئەسکەندەری مەقدوونی دا بـوو ، یەکێک لەو کەسانە کە ویستویە بیخواتـــەوە ئەسکەندەر بووە و بۆیشی رێک نەکەوتووە •

هەروەها هێنایە بە کارەساتی یوسف ، کە براکانی خستیانـــە چاڵەکەوە و پاشان لە لایەن کاروانێکەوە دەرهێنرا و برایە میسر ، لـە پاش ماوەیەک لەوێ‌دا بوو بە عەزیزی میسر •

وە یا « حەریق » ئەڵێ :

**« بولبولێکی خوشنەوا بووم بۆ نەوای دەوری گوڵت »**

**« کێ وەکوو (هودهود) حکایاتی سەبای گێرِایەوە ؟!»**

ئیشارەیە بە داستانی پەپووسلێمانە و سولەیمانی پێغەمبەر ؟ کە پەپووسلێمانە چوو بۆ شاری « سەبا » ، بەڵکیسی دۆزیەوە و خەبەرەکەی هێنایەوە بۆ سلیمان پێغەمبەر •

وە یا بۆ پەندی پێشینان ، وە یا داستان « شێخ رەزا » ئەڵێ :

**« گەلێکم کرد لەگەڵتا ئەی هەتیوەی نێرەکەرە »**

**« جەزاکەم وا دیارە وەک مارەکەی شێخ ئۆمەرە ! »**

ئەمە هەم بۆ پەندەکەش دەست ئەدا ، هەم بۆ داستانەکەش • کە :

مارێک لە ترسی دوژمن هەڵات و تۆشی شێخ ئومەر بوو ، وتی داڵدەم بدە ، لەپاش گەڵێ کەین و بەین لە بەینیانا ، شێخ ئومەر مارەکەی لە ناو مکی خۆیا شاردەوە • پاش ئەوە کە دوژمنەکە رویشت ، مارەکە ترسی نەما ، بە شێخ ئومەری وت : ئێستە بە جەرگتەوە بدەم ، یا بە دڵتەوە ! •

وە بۆ پەندی پێشینانی « رووت »یش وەکوو «پیرەمێرد» ئەڵێ :

**« پێم ئەڵێن : ریست وەک خوری خاوە »**

**« کوێر هەتا دەمرێ بە تەمای چاوە »**

**یەکێ ئەڵێ : « ریسەکەی بوو بە خوری »•**

**یەکێ ئەڵێ : « کوێر هەتا ئەمرێ هەر بە تەمای چاوە ! »•**



یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری « گردکردنەوە »یە • لە بەلاغەی عەرەبی‌دا بەم چەمکە ئەوترێ « عقد » •

ئەم گردکردنەوەیە ئەوەیە کە پەخشان بکرێ بە هۆنراو بەڵام نەک لەسەر ڕێگای « لێی وەرگرتن » ؟ واتە ئەگەر پەخشـــانەکە «قرآن» وە یـا « حدیث » بوو ، کردنی بە هۆنراو وەختێک ئەبێ کە گۆڕرانێکی زۆری تێدا بکرێ ، وە یا دەستنیشانی ئەوە بکرێ کـــە « قرآن » ، وە یا « حدیث »•• لە لێی وەرگرتنا ئەم جۆرە شتانە نەبوو• وێنە وەکوو ئەم پەخشانە ــ کە دەقێقەکە و ــ ئەڵێ :

« هۆشی نایەتەوە بە بەر خۆیا تا ئەو ڕۆژە کە سەر ئەخاتە سەر بەردی ئەلحەد » ئەو وەختە تێ ئـەگا کە تا لە دنیادا بووە ، مردوو بووە ، چونکە بێ ئاگا بوو لە ئیشی چاکە ! » •

« صفوەت » ئەم پەخشانەی کردووە بە هۆنراو و ئەڵێ :

**« ئەو وەختەی کە وا لـــە دنیادا بـــوو »**

**« لە ڕاستی چاکە مردۆێک بوو زیندوو »**

**« ئەو ڕۆژەی دانا سەر لە سەر ئەلحەد »**

**« بۆی دەرکەوت کە وا زیندوێکە مردوو ! »**

**« بەڵام بێ کەڵکە زیندوێتی ناو خـــاک »**

**« زیندوو چاکەیە ، تا نەبووە مـــردوو ! »**



یەکێکی‌تر لە هونەری جوانکاری « هەڵوەشاندنەوە »یە • ئـــەم جەمکە لە بەلاغەی عەرەبیدا بە « حل » گوزارشتی لێی ئەدرێتەوە •

ئەم هەڵوەشاندنەوەیە پێچەوانەی گردکردنەوەیە ؟ واتە هۆنراو بکرێ بە پەخشان • بـــەڵام ئەمەش کاتێ جوان ئەبێ کە شـــێوە و دارشتنی پەخشانەکە لە هی هۆنراوەکە بەهێزتر بێ • وێنەی ئەمەش وەکوو « قانع » ئەڵێ :

« من و تۆ پێکەوە با ئاشـــنا بین »

« وەکوو پەروانــە و شوعلەی چرا بین »

ئەدیبێـک ئـەم هۆنراوەی لە شێوەی پەخشانا دەر بڕیـــوە و ئەڵێ :

« چۆن پەپوولە - وێنــــەی گەردانەی مـــرواری دەور مل - ئەسووڕڕێتەوە بە دەورەی چرادا ، تو خوا با من و تۆیش بەو جۆرە بین؛ من پێم خۆشە پەروانە بم ، تۆیش پێت خـــۆش بێ با چـــرای من بیت ! . . »



# دوایی

بابەتێکی‌تر کە بۆ هۆنەر ، وە یا نووسەر پێویستە ئەوەیە کە بزانێ چۆن دەست بە بەرهەمەکەی ئەکا ؟ . چۆن ئەچێتە ناویەوە ؟ . چۆن لێی ئەبێتەوە ؟ .

ئەبێ بۆ ئەوە کە شتەکەی لە دڵی گوێگر ، وە یا خوێنەرا جێگای خۆی بگرێ ، هەموو دەم بە شتی جوانی لە بار بۆ ئەو شوێنە دەستپێی بکا ؛ واتە بە جۆرێک بێ کە دڵ رووی تێ‌ی بکا ، دڵی ئەو گوێگر ، وە یا خوێنەرە بگەشێتەوە ، نەوەک خەم رووی تێ‌ی کا ، ئەگەر بابەت بابەتی ماتەمی‌ی نەبوو .

چاکتر دەستپێی‌کردن ئەوەیە پێش ئەوە بچێتە جەرگەی باسەکەوە ئیشارەیەک بکا بە بابەتی ناوەرۆکی شتەکەی . کە بەمە لە بەلاغەی عەرەبی‌دا ئەڵێن . براعة الاستهلال . .

ئەم رستەیە لە عەرەبی‌دا لەوە وەرگیراوە ، کە منال سەرەتا پەیدا ئەبێ دەنگێکی لێوە دێت ، ئەو دەنگە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو منالە گیانی تێدا هەیە . زانایانی بەلاغە لەوەوە وەریان گرتووە و گواستوویانەتەوە بۆ ئەو چەمکە ، کە سەرەتای دەستپێی‌کردنەکە شتێکی تێدا بێ ئیشارە بکا بە ناوەرۆکی بابەتەکە .

من بەلامەوە وایە کە « نموونە » بۆ ئەو چەمکە جێگای خۆیەتی. بە وێنە ، وێنە بۆ ئەم « نموونە » وە یا « براعة الاستهلال ». ، لە هۆنراوەدا چامەکەی «نالی»یە کە لە بارەی سولەیمان پاشا و ئەحمەد پاشای بابانەوە بەم هۆنراوە دەستپێی‌ی ئەکاو ئەڵێ :

**« تا فەلەك دەوری نەدا ، سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو »**

**« کەوکەبەی ماهی موبارەك ، تەلعەتی پەیدا نەبـوو »**

وێنەیەکی تەواوە بۆی •

وە یا لە پەخشانا سەرەتای باسی ئەو هۆنەرانە کە «سجادی» لە « مێژووی ئەدەبی کوردی »دا هێناویەتەوە بۆیان « نموونە » ، وە یـــا « براعة الاستهلال »ن •

بە وێنە وەکوو لە سەرتای باسی « حەمدی »دا ئەڵێ :

**« قارەمانی سێ‌هەمی مەیدانی شعر لە بەرە بابی « صاحبقران » • پاسەوانی بەخەمی خەرمانی ئەدەب لەم دەورەی دوایی کوردان • پابەندی وردی مەعنـــا بە هەموو هێزێکیەوە • دلبـــەندی پێزی قسە بە هەموو تینێکیەوە •••••• »**

دووەم کە چووە ناو باسەکە وردە وردە بە سەرە پیا بێت ، زنجیرەی بیرەکەی نەپچرێت • لە دەستپێی‌ی کردنەکەیەوە بە خۆشی کە هاتووە بگاتە سەر بابەتەکە• لە بابەتەکەش بە داررشتنێکی جوان لێی دەرچێت و رێگا ون نەکا •

هەرچەندە جاری وا ئەبێ کە لە ناوەندی باسەکەیا وە یا رستەکەیا باز ئەدا بۆ شتێك کە هیچ پەیوەندی لەگەڵ باسەکەیا نی‌یە ـ کە بەمە ئەڵێن « اقتضاب » ـ • ئەگەر هات و ئەو رستەیە کە کەوتۆتە ناوەندی باسەکەیەوە کەم بوو • ئەمە بەلای گەلێ لە زانایانی بەلاغەوە وەنەبـــێ ناشیرین بێ ، بەڵکوو شیرینە ، شیرینیەکەش لـــەبەر ئەوەیە گوێگر • گوێ بۆ باسەکەی راگرتووە ، لە ناکاو گوێ لە شتێـــــکی‌تر ئەبێ • ئەسڵەمێتەوە ، ئەم تەزووەهانی ئەدا بۆ ئەوە زیاتر هەستی بەلای قسەکەوە بچێت • وەکوو ئـەوە یـەکێـکی‌تر بابەتێـکی بۆ باس ئەکا و ئەڵێ :

**« کە رووەیشتێن زۆری نەما بوو بگەینە سەر لووتکەی شاخەکە • ئاسکێك •••••• »**

**« تۆ ئەزانی کتێبەکە بە خەتێکی جوان نووسرا بووەوە »**

ئەگەڕرێتەوە سەر باسەکەی و ئەڵێ :

**« بەوێ دا تێی پەڕی ، لەولاوە کەلێکیش هات ، لووت و بزووت لەگەڵ ئاسکەکە دا تووشی یەک بوون »**

ڕستەی **« تۆ ئەزانی کتێبەکە بە خەتێکی جوان نووسرا بووەوە »** هیچ پەیوەندیەکی بەو قسەوە نی یە کە دەستی داوەتێ و ئەیگێڕرێتەوە ، بەڵام گوێگر ئەسڵەمێتەوە و زیاتر هۆشی ئەداتێ .

سێیەم لێی بوونەوەیەتی لە باسەکەی . ئەبێ بە جۆرێ لێی بێتـــەوە کە گوێگر بـــۆی دەرکەوێ ئـەوا خەریکە لـە بابەتەکەی ئەبێتـــــــەوە .

ئەم سێ ڕێگایە وەکوو ئەوە وایە کە یەکێک دەست ئەدا بـــــە هەورازێکەوە ؟ چۆن لە سەرەتاوە چاکی لێ هەڵئەکا ؟ . و چۆن وردە وردە بـــــە هەورازەکەدا سەر ئەکەوێ ؟ . لەو لاوە سەرەوخـــوار ئەبێتـــــەوە ؟ .

نووسینەکە کومیدی بێ ، یـــا تراژید ، هەر یەکە شێوەی خۆی دیارە و لە سەر ئەو ناساندنە کە باسکرا ، لەگەڵ ئەوانیشا بەو جۆرە ئـــــەکەی .



# سەرچاوە

بۆ دانانی ئەم کتێبە تەماشای ئەم سەرچاوانە کراوە :


١ ـ مختصر المعاني ـ التفتازاني ـ ١٩٥٤ ٠

٢ ـ البيان والتبيين ـ الجاحظ ـ قاهره ـ ١٩٤٩ ٠

٣ ـ اسرار البلاغة ـ عبدالقاهر الجرجاني ـ قاهره ٠

٤ ـ دلائل الاعجاز ـ عبدالقاهر الجرجاني ـ ١٣٦٧هـ ٠

٥ ـ تفسير البيضاوي ـ چاپی قاهره ـ ١٣٥٥ هـ ٠

٦ ـ شرح المواقف ـ سيد شريف الجرجاني ـ ١٩٠٧ ٠

٧ ـ جمع الجوامع ـ تاج الدين السبكي ـ چاپی قاهره ٠

٨ ـ شرح المطالع ـ قطب الدين الرازي ٠

٩ ـ تجريد الكلام ـ نصير الدين الطوسي ٠

١٠ـ الاغاني ـ لابي فرج الاصفهاني ـ چاپی قاهره ٠

١١ـ احياء علوم الدين ـ غزالي ـ قاهره ـ١٩٣٣ ٠

١٢ـ رسالة الاستعارة والوضع ـ مەلا ئەبوبەکری میر روستەمی ـ دەستنورس ٠

١٣ـ القاموس المحيط ـ مجد الدين الفيروزآبادي ـ مصر ـ ١٩٣٨ ٠

١٤ـ ثقافة الناقد الادبي ـ الدكتور محمد البويهي ـ ١٩٤٩ ٠

١٥ـ النقد الادبي ( ستانلي هايمن ) ترجمة الدكتور احسان عباس. والدكتور محمد يوسف ٠

١٦ـ الصوفية في الاسلام ـ نيكلسون ـ ترجمة نور الدين شريبه ـ. قاهره ١٩٣٩ ٠

١٧ـ نقد الشعر ـ قدامه بن جعفر ـ ١٩٣٤ ٠

١٨- ميزان الذهب في صناعة شعر العرب - سيد احمد الهاشمي - ١٩٦١
١٩- العقيدة المرضية - قاهره ١٣٥٢ هـ •
٢٠- العقد الجوهري في شرح ديوان الشيخ الجزري - احمد الملا محمد البهتي الزفنكي - القامشلي - ١٩٥٨ •



٢١- تاريخ ادبيات ايران - ادوارد براون - ١٣٤١ ش •
٢٢- برهان قاطع - محمد حسين برهان •
٢٣- مثنوى - مولانا جلال الدين رومي - تهران - ١٣١٩ ش •
٢٤- ئايين سخنوزى - محمد علي فروغى - تهران - ١٣٣٠ ش •
٢٥- سبك شناسى - بهار محمد تقي •
٢٦- آثار عجم - محمد نصير فرصت شيرازي - بمبى - ١٩٥٤ هـ
٢٧- حافظ شيرازي - باهتمام محمد قزويني و دكتور قاسم غنى - تهران - ١٣٢٠ هـ•ش
٢٨- گلستان سعدى - بغداد - المكتبة العربية •
٢٩- فرنود سار - دكتور علي اكبر نفيسى - تهران ١٣٢١ - ١٣٤٣ش•



٣٠- فرهنگ مردۆخ - محمد آيت الله مردوخ •
٣١- گۆڤارى گەلاوێژ - بەغدا •
٣٢- گۆڤارى هيوا - بەغدا •
٣٣- مێژووى ئەدەبى كوردى - علاءالدين سجادى - چاپى دووەم - بەغــدا - ١٩٧١ •
٣٤- ئەدەبى كوردى و لێكۆڵینەوە لە ئەدەبى كوردى - علاءالديــن سجادى - بەغدا - ١٩٦٨ •
٣٥- نرخ شناسى - علاءالدين سجادى - بەغدا - ١٩٦٩ •

٣٦- دیوانی مەولەوی ـ بە شەرحی مەلا عبدالکریمی مدرس ٠
بەغدا ـ ١٩٦١ ٠
٣٧- دیوانی نالی ـ بە شەرحی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح و محمد
ـ کۆرری زانیاری کورد ـ بەغدا ـ ١٩٧٦ ٠
٣٨- دیوانی نالی ـ علي مقبل ـ تهران ـ ١٣٢٧ ش ٠
٣٩- دیوانی نالی ـ دەستنووس ٠
٤٠- دیوانی مەلای جزیري ـ دەستنووس ٠
٤١- کۆمەڵە دەستنووسی گەلێ لە هۆنەران کە لە بەیازەکانا
نووسراونەتەوەو لە لای من هەیە ٠ لەگەڵ کەشکۆڵەکەمدا ٠
٤٢- دیوانی ـ سالم ـ بەغدا ١٩٣٣ ٠
٤٣ ـدیوانی مەحوی ـ بە شەرحی مەلا عبدالکریمی مدرس ـ بەغدا ـ
١٩٧٧ ٠
٤٤- دیوانی شێخ رەزا ـ بەغدا ـ ١٩٤٦ ٠
٤٥- دیوانی دڵدار ـ هەولێر ٠
٤٦- دیوانی ئەحمەد حەمدی ـ دەستنووس ٠
٤٧- دیوانی زێوەر ـ دەستنووس ٠
٤٨- گولدەستەی شعرای هاو عەسرم ـ علي کەمال باپیر ١٩٦٩٠
٤٩- دیوانی سەلام ـ بەغدا ـ ١٩٥٨ ٠
٥٠- دیوانی حەریق ـ بەغدا ـ ١٩٣٩ ٠
٥١- دیوانی ناری ـ دەستنووس ٠
٥٢- دیوانی تاهربەگ ـ سلیمانی ـ١٩٣٦
٥٣- دیوانی حاجي قادری کۆیی ـ بەغدا ـ ١٩٢٥ ٠
٥٤- کۆمەڵە شعری شاعرانی کورد ـ بەغدا ـ ١٩٣٨ ـ کۆکردنەوەی
مەلا عبدالکریمی هەکزی ٠
٥٥- پەندەکانی پیرەمێرد ـ بەغدا ـ کۆکردنەوەی کاکەی فەللاح ٠

٥٦- دیوانی بێخود - بەغدا - ١٩٧٠ •

٥٧- دیوانی قانع - بەغدا •

٥٨- دیوانی مصباح - بەغدا - ١٩٣٩ •

٥٩- گۆرانی یا ترانهای کوردی - دکتور محمد مکری •

٦٠- رەوانبێژی - عەزیز گەردی - هەولێر - ١٩٧٢ - ١٩٧٥ •

٦١- پەندی‌پێشینان - کۆکردنەوەی شێخ محمدی خاڵ •

٦٢- پیرەمێردی نەمر - بەغدا - ١٩٧٠ •

٦٣- رشتەی مرواری - علاءالدین سجادی - بەغدا - ١٩٥٧-١٩٧٢ •

٦٤- دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی - عەرەبی - فارسی •
علاءالدین سجادی - بەغدا - ١٩٦١ •

# فەرهەنگی وشەکان

| | |
|---|---|
| رەوانبێژی | بەلاغە |
| بابەت | مەوضوع |
| هونەر | فن |
| چەمک | مەفهووم |
| گوزارە | مەعنا |
| هۆنراو | شعر |
| هۆنەر | شاعر |
| پەخشان | نثر |
| ئامێز | وەکوو |
| بەلگە | ئەثەر |
| زانکۆ | جامعە |
| نەتەوە | قەوم |
| شارۆ | مالّینەوە |
| بەرهەلست | مانع |
| هۆ | سەبەب |
| گەوارا | خۆش و رەوان |
| خوشخوانی | بەلاغە |
| هونەرە قسەیە ئاشکراکان | الفنون البيانية |
| فراوان | بلاو ، واسع |
| وشە | كلمة |
| هاماو | کلّی |
| باژ | جزئي |
| وەک یەک | تەشبیە |

| | |
|---|---|
| دەق | نص |
| لێی چوون | مشبه |
| لەو چوون | مشبه به |
| لێکچوون | وجه الشبه |
| ئەوزار | ئەدات |
| زمانپاراو | بليغ ، فصيح |
| زماندار | فصيح |
| خواستن | ئیستعارە |
| خوازە | مەجاز |
| درکە | کنایە |
| لێی خواستراو | المستعار منه |
| بۆ خواستراو | المستعار له |
| فرە | زۆر |
| رەسەنی | ئەصلی |
| نەژاد | ئەصیل |
| گوزارشت | تەعبیر |
| هەست | حسّ |
| بایس | عیللەت ، لازم |
| فرمان | ئیش |
| فەرمان | ئەمر |
| هاوگری | نیسبی |
| ئازۆخە | تفاق ، زەخیرە |
| مرۆف | پیاو ، ئینسان |

| چەخماخ | ئەستێ |
|---|---|
| برژتەو | زۆر ڕووناک ، شعاع |
| کرنووش | سجدە |
| قسەچن | فیتنە |
| ئاخلە | خەرمانە |
| چەشن | جۆر |
| مەردم | خەڵک |
| بەسە | مەعنا |
| گەڵ | جمع ، مجموعة |
| چۆنیەتی | حەقیقەت ، ماهیت |
| وێنە | میسال |
| بۆتە | بۆدەقە |
| خوێنەر | قاریء |
| نووسەر | کاتب |
| راناو | ضمیر |
| هێما | ئیشارە |
| رستە | جوملە |
| راڤین راڤە | شەرح ، ئەمیرا |
| بەیار | نەکێڵراو |
| ناو | ئیسم |
| کردەوە | فعل |
| تەحر. | جۆر |
| ئەنجومەن | مجلس |
| قەشەنگ | جوان |
| نەوا | ئاواز |

| چەخماخە | هی تفەنگە |
|---|---|
| تابۆ | شبح |
| بنەرەتی | ئەساسی |
| واژە | کلمة |
| جەخت | تأکید |
| دەستوور | قاعدە |
| یاسا | قانوون |
| سروشت | تەبیعة |
| هەستوون | کۆڵەکە ، رکن |
| ترۆم | نەوع |
| ئەندێشە | خەیاڵ |
| ئیشکیل | حوکم |
| چورت | وەنەوز |
| رەدوو | تابع |
| پیت | حەرف |
| کتک | پشیلە |
| دەوار | رەشماڵ |
| دەست نیشان | تعیین |
| بەخشندە | سەخی |
| ئاخاوتن | قسەکردن |
| را گەیاندن | تەبلیغ |
| رۆچوون | غلوّ |
| لەرێ دەرچوون | اغراق |
| وەسپ | وەسف |
| خوسپ | زەم |
| تەوزیم | واجب |
| دان‌پانان | اعتراف |

| | |
|---|---|
| کێش | وەزنی عەرووزی |
| سەروا | قافیە |
| سەروادار | سجع |
| چامە | قەسیدە |
| کژ | فەسل ، وەختی سال |
| گیانلەبەر | حیوان |
| روەک | نەباتات |
| پەیوەندی | علاقە |
| پارێزگار | وارع |
| دەسەڵات | سلطة |
| زەبەر بە دەست | قوی |
| توانا | قوة |
| ناساندن | تەعریف |
| مەڵبەند | یلاخ ، جێگا |
| قەبارە | جسم |
| گەواهی | شاهدی |
| خاسە وێژی | سفەت |
| تەوس | تەشەر ، تەعنە |
| گونجایش | خونجان ، بۆ یەک شیان |
| شەیدا | دێوانە |
| سوور | « مصر » |
| جەوشەن | زرێ |
| خەفتان | زرێ شەرر |
| کۆز | کۆلێتی بەرخ |
| کرۆک | نێرک ، کاکڵە |
| چرووک | رژد |

| | |
|---|---|
| پاکژ | پاک ، خولاسە |
| گونجاندن | شیاو |
| هێشۆ | هۆشە ، عنقود |
| دووپات | دووبارە ، تکرار |
| سڵ | ترس |
| سڵ کردنەوە | ترسان و کۆ ، لەشت کردنەوە |
| ئەسڵەمێتەوە | رائەچەنێ |
| کەڵ | گاکێوی، حەچەی کێوی |
| هەوراز | سەرەو ژوورە |
| نشێو | سەرەو خوارە |
| چەنبەر | دائرە |
| رەوینەوە | بڵاوبوونەوە ، تافر |
| بیانی | غەریب |
| دۆان | خەتابە |
| وتار | مەقالە |
| راوێژ | لێرەدا بە مەعنا دەستوورە |
| موتوربە | پەیوەند |
| باو | رەواج |
| لەنگەر | قورسایی |
| بتەو | سفت ، سەخت |
| گوزارە کاری | مەعانی |
| رەوانکاری | بەیان |
| جوانکاری | بەدیع |

# ستوونی راست و چەوت

| لاپەڕە | دێـــڕ | چەوت | راست |
|---|---|---|---|
| ٦ | ٢١ | ئـــەو | ئەوە |
| ١٣ | ١٤ | نەخۆ | نەحو |
| ١٧ | ٢٣ | رەونبێژی | رەوانبێژی |
| ٢٢ | ٢ | موسەند الیە | موسنەدالیە |
| ٢٣ | ٢١ | « دارە » | « دار » |
| ٣٢ | ٢ | بگێرێتەوە | بگێرـرێتەوە |
| ٤٦ | ١٨ | ئایزە | ئازیزە |
| ٦٢ | ١٠ | خوارۆە | خوراوە |
| ٩١ | ٦ | گواسنۆتەوە | گواستۆتەوە |
| ١٠١ | ٧ | بهێزێتەوە | بهێنرێتەوە |
| ١٠٣ | ٣ | گرزرەترا | گزرە درا |
| ١٠٨ | ٦ | هە | هەر |
| ١٠٩ | ٢٠ | راگەیانن | راگەیاندن |
| ١١٠ | ١٣ | ئەگەرێتەوە | ئەگرێتەوە |
| ١١١ | ٢٥ | نشۆی | نۆشی |
| ١١٣ | ١٥ | ئەکەوتوونەتە | نەکەوتوونەتە |
| ١١٣ | ١٧ | باڵی | پاڵی |
| ١٢٢ | ٦ | دەرێکە | دەردێکە |
| ١٢٢ | ١٢ | بە | بەم |
| ١٢٣ | ١١ | کۆتر | کۆترە |
| ١٢٦ | ١٨ | قسە | قسەی |

| لاپەڕە | دێڕ | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ١٣١ | ٢٣ | ڕەگەزدۆزي | بە ڕەگەزدۆزی |
| ١٣٤ | ١٨ | عەرەبی | عەرەبي بە |
| ١٣٧ | ١٨ | زۆز | زۆر |
| ١٤٦ | ٧ | ئەجزانە | ئەحزانە |
| ١٤٧ | ٢٢ | لەماوە | نەماوە |
| ١٤٨ | ٢٢ | پیاڵە | پیاڵەی |
| ١٥٣ | ١٩ | زمایانە | نمایانە |
| ١٥٦ | ٦ | ( ، . ؛ [illegible] | چەم ! . ، |
| ١٥٩ | ٦ | دەقیقەکە | دەقیکە |
| ١٥٩ | ١٩ | جەمکە | چەمکە |

# ناواخن

لاپەرەە

لاپەڕە

لاپەڕرە

لاپەڕە




رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغـداد (١١٢٤) لسنة ١٩٧٨

٢٠٠٠/٣٢٩
١٩٧٨/٩/١٥